**له جیاتی پێشەکی:**

ئۆریانا فالاچی لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بەهەشتی سەر گۆی زەوی ئەو ڕۆژە لە ناو نەچوو کە خوا بە ئادەم و حەوای گوت لە مەوبەدوا دەبێ بە ئارەقەی نێوچاوان بژیوی ژیانیان دابین بکەن و لە بارودۆخێکی ئاوا دژواردا وەچە بخەنەوە، بەهەشت ئەو ڕۆژە لەناو چوو کە ئادەم و حەوا تێگەیشتن ئەربابێکیان هەیە کە سێو خواردنی لێ قەدەغە کردوون. ئەو مانای ژیانی ڕاستەقینەی لە مل نەدان بە یاسا و ڕێسا داسەپاوەکاندا دەدۆزیەوە و دەیگوت مەرگی ڕاستەقینەی کەسێك ئەو کاتەیە کە گوێڕایەڵ و ملکەچی دابونەریتە داسەپاوەکان دەبێت.

ئەو کتێبەش پێشکەشە بە خۆشەویستەکەم و سەرجەم ئەو کەسانەی کە ڕەزایان بە قەزا نەدا و خۆیان بە دەستی چارەنوس نەسپارد.

**به پێویستی نازانم درۆ بکەم!**

**من وەکو زۆربەی هاوڕەگەزەکانم ڕاستییەکان ناشارمەوە!**

**ئەوەیکە لە زمان قارەمانی ئەم کتێبەوە گێڕاومەتەوە،**

**بەسەرهاتێکە کە ـ زۆر لە مێژ نییە ـ بە سەر خۆم هاتوە!**

**من دووگیان بووم،**

**عاشقی ئەو کۆرپەلەیە بووم کە لە سکم دابوو**

**و ...**

ئەمشەو هەستم بە بوونی تۆ کرد: وەکو دڵۆپێک لە ژیان کە لە هیچەوە تکابێ! چاوم هەڵێنابوون و لە تاریکانێکدا کە چاو چاوی نەدەبینی، ڕاکشابووم

که له ناکاو مچوڕکێکی دڵنیایی له بوونت به لەشم دا هات: بەڵێ! تۆ لەوێ بووی! لەوێ بووی! هەر وەک ئەوە دەچوو کە گوللەیەک لە دڵم درابێ! کاتێک سەر لە نوێ ترپەی دڵیم بیستەوە، هەستم کرد کە لە چاڵێکی مەترسیدار کەوتووم! خەریکم لە گەڵ تۆ دەدوێم، بەڵام مەترسییەکی هەژێنەر سەرتاپێمی داگرتوە! لە چواردیواری ئەو مەترسییەدا یەخسیر بووم و خۆم لێ ون بوو! هەوڵبدە لێم تێبگەی! من لە خەڵکی تر ناترسم و کارم بە کاریانەوە نییە! لە خوداش ناترسم! باوەڕم بەم قسانە نییە! تەنانەت ئێش و ئازاریش نامترسێنێ! هەموو ترسی من تۆی! تۆیەک کە دەستی چارەنووس لە هیچی جیا کردوویەوە و بە سکی منیەوە نووساندووی! بەردەوام چاوەڕێت بووم و هیچکات ئامادەی پێشوازی لێکردنت نەبووم! بەردەوام ئەم پرسیارە مەترسیدارەم بۆ دەهاتە پێشەوە کە: نەکا نەتهەوێ چاوت بە ژین بپشکوێ؟ نەکا ڕۆژێک لە ڕۆژان بە سەرمدا بنەڕێنی کە: کێ وتبووی منت ببێ؟ بۆ دروستت کردم؟ بۆ؟

ژیان یانی هیلاکی! بچکۆلەکە! ژیان شەڕێکە کە بەردەوام دووپات دەبێتەوە و لە جیاتی شادیەکانی ـ کە تەنیا بە قەدەر چاوتروکانێکن ـ دەبێ نرخێکی زۆر بدەی! ئاخر چۆن بزانم کە فڕێدانت کارێکی شیاوە یان نا؟

چۆن بزانم کە حەز دەکەی بە بێدەنگی بگەڕێیەوە یان نا؟ خۆ تۆ ناتوانی لە گەڵم بدوێی! ژیانت تەنیا گرێ کوێرەیەکە! گرێ کوێرەیەک کە چەنددانە

خڕۆکەی (سلول) نوێ پێکیان هێناوە! لەوانەشە هەر ئەگەرێک بی و زیندەوەرێک لە گۆڕێدا نەبێ! بەڵام سەرەڕای هەمووی ئەمانەش ئامادەم هەموو دارونەدارەکەم بدەم لە پێناو ئەوەیدا کە تۆ بە ئاماژەیەک یارمەتیم بدەی! دایکم دەیگوت لە لایەن منیشەوە ئاماژەیەکی ئاوای پێکراوە و هەر بۆیە هێشتوویەتی منی ببێ! دایکم نەیدەویست منی ببێ! من بە هۆی هەڵە و چەند ساتێک خافڵانی باوکمەوە دروست بووم! بۆ ئەوەیکە لە دایک نەبم، هەموو شەوێ حەبێکی لە پەرداخێک ئاودا دەتواندەوە و بە گریانەوە دەیخواردەوە! هەموو شەوێ ئەوە کاری بوو هەتا جارێکیان هەستی بەوە کرد کە من خەریکم لە ناو سکیدا بیحاریان دەکەم بۆ ئەوەی تێی بگەیەنم کە نامهەوێ لە ناوم بەرێت! رێک لەو کاتەدا کە پەرداخەکەی بۆ لای دەمی دەبرد، لە مانای بێحاریەکانی من تێگەیشت و حەبە تواوەکەی نێو پەرداخەکەی رشت و نەیخواردەوە! چەند مانگ دواتر من وەکو قارەمانێکی براوە لە ژێر خۆری هەتاودا گلۆرەم دەکردن! سەرەڕای هەمووی ئەوانە دیسانیش نازانم کە دایکم کارێکی باشی کردوە یان نا؟ کاتێک کە خۆشحاڵم پێموایە کاری باشی کردوە و کاتێکیش خەمینم پێموایە کارەکەی هەڵە بوە! بەڵام تەنانەت ئەو کاتانەش کە هەست بە چارەڕەشیی خۆم دەکەم، ناڵێم خۆزگە لە دایک نەبووبام! هیچ شتێک لە نەبوون خراپتر نییە! دیسانیش دەڵێم لە ئێش و ئازار ناترسم! ئێش و ئازار لە گەڵ ئێمە لە دایک دەبێ، لە گەڵ ئێمە گەورە دەبێ و لە گەڵمان ئاوێتە دەبێ! بە

چەشنێک کە هەست دەکەین وەکو دەست و پێ دەبێ هەمیشە لە گەڵمان بێت! ئەگەر راستییەکەیت بوێ من لە مەرگیش ناترسم! کاتێک کەسێک دەمرێ ئاشکرایە کە بەر لەوە لە دایک بووە و ئاوا کەسێک رۆژێک لە رۆژان هەر لە هیچەوە سەریهەڵداوە! من لە هیچکات نەبوون و لە گوتنی ئەوەیکە هیچکات زیندوو نەبووم، دەترسم! زۆربەی ژنەکان لە خۆیان دەپرسن: بۆچی منداڵم ببێ؟ بۆ ئەوەی برسێتی بکێشێ؟ لە سەرما هەڵلەرزێ و بە هۆی خەیانەت و بێحورمەتی تووشی عەزاب ببێ؟ یان بە هۆی نەخۆشی و لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا تێدا بچێ؟ ئەم ژنانە هیچ هیوایەکیان بەوە نییە کە منداڵەکانیان تێر بن و جێگایەکی گەرم و گوڕ بۆ ژیان بدۆزنەوە! هیوایەکیان بەوە نییە کە کەسێک رێز لە مافی منداڵەکانیان بگرێ و ئەوانیش گەورە بن و ئەوەندە بژین هەتا بتوانن شەڕ و نەخۆشی لە سەر گۆی زەوی بسڕنەوە! لەوانەیە ئەو دایکانە ناحەقیان نەبێ، لەوانەشە هەر وانەبێ! بەڵام تۆ پێم بڵێ نەبوون باشترە یان ئازار چێژتن؟ من تەنانەت لە کاتی گریان بۆ ئەو شکست و ئێش و ئازارانەش کە لە ژیانمدا بە سەرم هاتوون، دیسانیش لە سەر ئەو باوەڕە بووم کە ئازار چێژتن لە نەبوون باشترە! ئەگەر سەبارەت بە ژیان یان پێ نانە نێو ئەم جیهانەوە رای منت دەوێ، دەبێ زۆر راشکاوانە پێت بڵێم کە: لە دایک بوون زۆر لەوە باشترە کە هیچکات لە دایک نەبی! بەڵام ئایا ئەوە مافی منە کە سەبارەت بە تۆش ئاوا بڕیارێک دەربکەم؟ ئایا ئەو کارە بەو مانایە نییە کە من، تۆم تەنیا بۆ

خۆم بوە؟ هەر نامههەوێ لە بەر دڵی من چاوت بە ژین بپشکوێ، چونکە هیچ پێویستییەکم پێت نییە!

لینگە فرتە ناکەی و وەڵامم نادەیتەوە! بە راستی دەکرێ تۆ ئاوا هێزێکت هەبێ؟ ماوەیەکی کورت لە تەمەنت تێپەڕیوە! زۆر گاڵتەجاڕانەیە کە لە دوکتورەکان ئیزن وەرگرم! بەڵام من لە جیاتی تۆ بەڵێنم دا: تۆ لە دایک ببی! دوای بینینی وێنەکەت ئەو بڕیارەم دا! وێنەی جنین ئاولەمەێکی سێ حەوتوویی کە وەکو هەموو وێنە زانستییەکانی دیکە لە گەڵ بابەتێک سەبارەت بە دووگیانی لە رۆژنامەدا بڵاو کرابۆوە! کاتێک لەو وێنەیەم دەڕوانی، ترسەکەم هەر بەو خێرایییەی کە بەرەولام دەهات، ئاواش لێم دوور دەکەوتەوە! وەکو گوڵێکی سیحراوی بووی! گوڵێکی بلووری کە سەرێک (تۆپە گوڵێک)ی لە سەر بێ! خاڵێکی گەورە کە دواتر بڕیار بوو ببێتە مێشکی تۆ! تۆزێک خوارتر کونێکی تێبوو کە رەنگە دواتر ببوایە بە دەمت! هەر بەو چەشنە کە لە وێنەکاندا دەردەکەوێ لە ماوەی سێ حەوتووی یەکەمدا هیچ نیشانەیەکت لێ دەرناکەوێ، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش تارمایییەک لە چاو و موورەغەی پشت و عەسەب و ریخۆڵە وردە وردە لە لەشتدا چەکەرە دەکات! دەڵت تەواوە! زۆریش گەورەیە! لە چاو جەستەی خۆت نزیکەی نۆ جار لە دڵی من گەورەترە! خێراخێرا وەکو ترومپا کار دەکات و دوای رۆژی هەژدەهەم لێدانەکەی ئاسایی دەبێتەوە! چۆن دەتوانم فڕێت بدەم؟ بە من چی کە تۆ بە هۆی هەڵەیەکەوە دروست بووی؟ بۆ مەگەر ئەو جیهانەی کە

ئێمە تێیدا دەژین هەر لە سەر هەڵەیەکی وا دروست نەبوە؟ هێندێک کەس دەڵێن لە سەرەتادا هیچ شتێک نەبوە بێجگە لە هێمنی و بێدەنگییەکی تەواو! دواتر بروسکەیەک لێدرا، جووڵەیەکی گەورە ... دواتریش شتێک دروست بوو کە هەتا ئەو کات نەبوو! هەر لەم کات و ساتەدا رەنگە بە هۆی هەڵەیەکەوە بە هەزاران هەزار خرۆکە بەرهەم هاتبن! ئەو خرۆکانە بوونە خرۆکەی تر و ئەوەندە بەرەوپێش چوون کە دار و درەخت و ماسی و مرۆڤەکان سەریان هەڵدا! پێتوایە کەسێکە بەر لەم رووداوانە توانای هەڵبژاردنی بووبێت؟ کەسێک لە خرۆکەی یەکەمی پرسیوە کە داخوا لەم بەسەرهاتانە رازییە یان نا؟ پێتوایە هیچکەس نیگەرانی برسێتی و سەرما بوە؟ من ئاوا گریمانەیەکم قەبوڵ نییە! خۆ ئەگەر کەسێکیش بووبێ کە ــ وەکو خودایەک کە لە سەرووی زەمەنەوە بێت و لە سەرەتا و کۆتایی هەموو شتێک ئاگادار بێت ــ پێموانییە زۆر ئاگاداری باشی و خراپی رووداوەکە بوبێت! هەموو رووداوەکە بۆیە رویداوە چونکە قەرار بوو روو بدات! بۆ تۆش هەر ئاوایە! من بەرپرسیارێتی ئەو هەڵبژاردنە وەئەستۆ دەگرم!

بە هۆی لە خۆبایی بوون نییە کە ئەم رێگایەم هەڵبژاردوە! بچکۆلەکە! نامهەوێ بە لە دایک بوونی تۆ کاتی خۆم بە سەر بەرم! بە بیریشم دا نایەت کە بە سکێکی زەلامەوە لە شەقامەکاندا ئاموشۆ بکەم! ئەوەندە تاقەتم نییە کە شیرت بدەمێ و تەڕ و وشکت کەمەوە و فێری قسەکردنت بکەم! من ژنێکم کە کۆڵێک بەڵێن و بەرپرسیارێتی و گیروگرفتی هەیە! گوتم کە

هیچ پێویستییەکم بە تۆ نییە، بەڵام تۆ هەر دەبێ لە گەڵم بی! گرینگ نییە کە خۆت پێت خۆش بێت یان نا! من هەر ئەو زوڵمەی کە لە دایک و باوک و نەنک و باپیریشم کراوە، دەیکەمە دیارییەک بۆ تۆش! دڵنیام ئەگەر لە یەکەمین گیانلەبەر کە ناویان ناوە ئادەم، بیانپرسیبایە کە: پێت خۆشە چاوت بە ژین بپشکوێ؟ لە ترسان سەری لێ دەشێوا و وەڵامی نەرێی دەدایەوە! بەڵام هیچکەس هیچ شتێکی لەو نەپرسی و ئەو چاوی بە ژین پشکوت و ژیا و دوای ئەوەیکە گیانلەبەرەکانی دیکەشی ــ کە هیچ کەسیش هیچی لەوان نەپرسی ـ وەدوای خۆیدان، مرد! بە کورتی هەموان هەر ئەو کارەیان کرد و ئەم بەسەرهاتە بە هەزاران ساڵە درێژەی هەیە و رەنگە ئەگەر بە زۆری نەبوایە، ئێمەش ئێستا زیندوو نەبوینایە!

ورەت بەرز بێ! بچکۆلەکە! باچاوت بە ژین بپشکوێ! پێتوایە تۆوی گیایەک کە زەوی کوون دەکات و وردەوردە چەکەرە دەکات، بێ ورەیە؟ هەر ئەوەندە بەسە کە شەماڵێک بێت و ئەو چەکەرەیە بکاتەوە بە هیچ! یان بەچکە مشکێک تۆزێک مەحکەم پێی لێ بنێت و سەر لە نوێ لە ژێر گڵی راکاتەوە! سەرەڕای هەمووی ئەوانە، ئەو ناترسێت و گەورە دەبێ و تۆوی دیکە دەردەکات و دارستانێکیان لێ بەرهەم دێنێت! ئەگەر رۆژێک لێم توورە بی کە بۆچی منت بوە؟ پێت دەڵێم: من رێک هەر ئەو کارەم کردوە کە دارودرەختەکان لە هەزاران ساڵ لەوە پێشەوە، دەیانکرد و ئێستاش دەیکەن! منیش پێموایە کارێکی گونجاوە!

گرینگ ئەوەیە کە کاتێک تێگەیشتین کە مرۆڤ دارودرەخت نییە، کاتێک تێگەیشتین کە خەم و خەفەت و مەینەتیەکانی مرۆڤ بە هەزاران بەرابەر گەورەترن لە هی دارودرەختەکان، کاتێک تێگەیشتین کە ئێمە پێویستیمان بەوە نییە کە دارستان بەرهەم بێنین، کاتێک تێگەیشتین کە هەر تۆوێک نابێتە درەخت و زۆربەی تۆوەکان بەر لە گەورە بوون هەڵدەوەرن یان لە ناو دەچن! بۆچوونەکانمان نەگۆڕین!

بچکۆلەکە! لەوانەیە بە پێچەوانەی هەر ئەو شتەش رووبدات!

بیرکردنەوەی ئێمە پڕاوپڕە لە شتی ناکۆک و دژ بە یەک! لەوانەیە تۆ قسەیەکت پێ باش بێت و هەر ئەو ساتەوەختەش هەست بەوە بکەیت کە بە پێچەوانەی ئەو قسەیەش راستە! بیرکردنەوەی ئەمڕۆکەی من لەوانەیە سبەینێ بە ئاماژەیەکی قامکم پێچەوانە بێتەوە! هەر لە بەر ئەوەیە کە هەست دەکەم گێژ بووم! رەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێ کە بێجگە لە گەڵ تۆ ناتوانم لە گەڵ کەسێکی دیکە دەردە دڵ بکەم! من ژنێکم کە ژیانی تەنیایی هەڵبژاردوە! باوکت لە گەڵم نییە! بۆ ئەوە ناڕەحەت نیم، تەنانەت کاتێکیش کە چاو لەو دەرگایە دەکەم و دەحەپەسێم کە ئەو بە هەنگاوی خێرا لێی چۆتە دەرێ و منیش هیچ تەقالایەکم بۆ پێشگرتن لە چوونەدەرێی نەکردوە! چونکە تەنانەت ئەگەریش رامگرتبایە، دیسانیش من و ئەو هیچ قسەیەکمان پێ نەبوو بە یەکتری بڵێین!

بردمیە لای دوکتۆر! زیاتر حەزم دەکرد بۆ چۆنێتی ئاگاداری کردن لە تۆ هێندێک رێنوێنیم بکات! دوکتورەکە هەروا کە سەری دەلەقاند وتی کە جارێ دەبێ راوەستم! وتی لە دووگیانبوونم دڵنیا نییە. پێشنیاری کرد دوو حەوتووی دیکە سەردانی بکەمەوە بۆ ئەوەی دەربکەوێ کە تۆ هەڵقولاّی خەیاڵ پلاّوەکانی من نی! بەلاّم من دوو حەوتووی دیکە تەنیا بۆ ئەوە دەچمەوە لای هەتا پێی بڵێم کە تەواوی زانیاریەکانی لە پاڵ حاسەی شەشەمی من و وارسکەی من، پولێک ناهێنن! چۆن پیاوێک دەتوانێت هەستی ژنێک دەرک پێبکات کە منداڵێک لە سکی دایە؟ خۆ پیاوەکان دووگیان نابن! بەڕاستی بەڕای تۆ دووگیان نەبوونی پیاوان کەموکۆڕییە یان تایبەتمەندییەکی باشە؟ هەتا دوێنێ پێموابوو تایبەتمەندییەکی باشە، بەلاّم ئێستا دەزانم کە نەهامەتییە! زۆر باشە کە مرۆڤ توانای ئەوەی هەبێ کە گیانلەبەرێکی دیکەی لە سکی دابێ و لە جیاتی کەسێک خۆی بە دوو کەس بزانێ! لە کاتی دووگیانیدا کات و ساتی وا دێتە پێشەوە کە هەست دەکەی بە سەر هەموو جیهاندا زاڵی! نە ئێش و ئازار و نە ئەو ئازادیانەش کە بە هۆی کۆرپەکەوە لێت زەوت کراون، هیچکامیان ناتوانن ئەو ئارامییەی کە هەتە کەمرەنگی بکەنەوە!

تۆ کچی یان کوڕ؟ حەز دەکەم کچ بیت و رۆژێک لە رۆژان هەر ئەو شتانەی کە ئەمڕۆکە من هەستیان پێدەکەم، تۆش هەستیان پێبکەی! دایکم دەڵێ: کچ بوون نەهامەتییەکی گەورەیە! و من هەموو قسەکانیم قەبوڵ نییە!

کاتێک زۆر دڵتەنگ دەبێ دەڵێ: ئاخ! خۆزگە پیاو بوومایە! دەزانم جیهانی ئێمە بە دەستی پیاوان و هەر بۆ ئەوانیش دروست کراوە و زۆروێژی و سەرەڕۆییش لە ناخیاندا رەگ و ریشەی کۆنی هەیە! لەو چیرۆکانەدا کە پیاوان بۆ پاساوی خۆیان لە سەر یەکیان ناون، یەکەمین بوونەوەر ژن نییە، پیاوێکە بەناوی ئادەم! دواتر سەروسەکتی حەوا دەردەکەوێ هەتا ئادەم بە تەنیایی نەمێنێتەوە و چەرمەسەریی بۆ دروست بکات! لە رەسمەکانی سەر دەرگا و دیواری کڵێسەکاندا، خوا پیرە پیاوێکی ریش سپییە، نەک پیرەژنێکی قژ سپی! سەرجەم قارەمانەکانیش هەر پیاون! لە پرومتەوە کە داهێنەری ئاگر بوو، هەتا ئیکار کە حەزی لە هەڵفڕین بوو! مەسیحیش کە بە روحێکی پیرۆز ناو دەبرێت، داکی تەنا وەک دایەن سەیر کراوە! سەرەڕای هەمووی ئەو قسانەش تەنانەت ئەگەر رۆڵی مریشکێکی کورکیش ببینی، ژن بوون شتێکی زۆر جوانە! شتێکە کە جەربەزەیەکی لە بڕان نەهاتووی دەوێ! شەڕێکی بێ کۆتاییە! ئەگەر کچ بی، دەبێ زۆر شت فێر ببی! بەر لە هەموو شتێک دەبێ زۆر بجەنگی هەتا بتوانی بڵێی ئەگەر خوایەک هەبێ دەکرێ وەکو پیرەژنێکی قژ سپی یان کچێکی جوان وێنەکەی رەسم بکەی! دەبێ زۆر بجەنگی هەتا بتوانی بڵێی، کاتێک حەوا سێوە قەدەغەکراوەکەی لێ کردەوە، گوناە پێک نەهات، ئەو رۆژە هێزێکی بەشکۆ سەری هەڵدا کە پێی دەڵێن گوێڕایەڵ نەبوون! دەبێ زۆر بجەنگی هەتا بتوانی بڵێی لە جەستەی تۆدا شتێک بەناوی عەقڵ هەیە کە حەز دەکەی گوێ لە دەنگی بگری!

دایکایەتی نە پیشەیە و نە ئەرکە! مافێکە لە نێوان ئەو هەموو مافانەی کە هەتە! هێندە هاوار دەکەی بۆ مافی خۆت کە هیلاک دەبی و بەشی زۆری ژیانت تووشی شکست دەبی! بەڵام نابێ دڵسارد ببیەوە! تێکۆشان لە سەرکەوتن خۆشترە! بەرەولای ئامانج رۆیشتن لە گەیشتن بە ئامانجەکە پڕبایەخترە! کاتێک بە ئامانج دەگەی یان براوە دەبی، لە خۆتدا هەست بە بۆشاییەک دەکەی! بۆ پڕکردنەوەی هەر ئەو بۆشاییە دەبێ سەر لە نوێ رێ بکەوی و ئامانجێکی نوێ بدۆزیتەوە!

بەڵێ حەز دەکەم تۆ کچ بی! هیوادارم کە هیچکات قسەکانی دایکم دووپات نەکەیتەوە، هەروەک چۆن من هیچکات دووپاتم نەکردنەوە!

***

ئەگەر تۆ کوڕیش بی، هەر خۆشحاڵ دەبم! تەنانەت لەوانەیە لە کچ بوونیشت زیاتر! ئەو کات تاموچێژی کۆیلەتی و هێندێک سوکایەتیش ناچێژی! بۆ وێنە ئەگەر کوڕ بی هیچکەس لە تاریکیدا دەستدرێژی ناکاتە سەرت! پێویست ناکات روخسارێکی جوانت هەبێ هەتا لە یەکەمین نیگادا سەرنجی هەموان راکێشی! کاتێک کە لە گەڵ هاوسەرەکەت خەوتووی، پێویست ناکات مل بە هەموو شتێک بدەی! هیچکەس پێت ناڵێت گوناە ئەو رۆژە دروست بوو کە حەوا سێوە قەدەغەکراوەکەی لێکردەوە! کەمتر تووشی عەزاب دەبی! پێویست ناکات بجەنگی و بیسەلمێنی کە دەکرێ خواش وەکو

پیرەژنێکی قژسپی رەسم بکەی، نەک تەنیا وەکو پیرە پیاوێکی ریش سپی! دەتوانی هەر کاتێک حەزت کرد، شۆڕش بکەی! دەتوانی دڵداریی بکەی، بێ ئەوەی شەوێک لە خەو راچڵەکی و هەست بە نوقم بوون لە زەلکاودا بکەی! دەتوانی بەرگریی لە خۆت بکەی بێ ئەوەیکە قسەی پڕ و پووچ ببیستی!

ئەگەر کوڕ بی دەبێ لە بەرامبەر لایەنەکانی دیکەی زوڵم و زۆر و کۆیلەتییەکاندا راوەستی! پێتوانەبێ ژیان بۆ پیاوەکان زۆر ئاسانە! ئەگەر بەهێز بی، کۆمەڵێک بەرپرسیاریێتی قورس دەکەوێتە سەرشانت! چونکە ریشت هەیە، ئەگەر دەست بەسەر داهێنانێکت بوێ یان بگری، هەموان پێت پێدەکەنن! دەبێ لە شەڕەکاندا یان کەس بکوژی یان خۆت بکوژرێی! چ بتهەوێت و چ نەتهەوێت، لە زوڵم و زۆرە سەیر و سەمەرەکاندا بەشدارت دەکەن! بەڵام لەوانەیە بۆ هەمووی ئەوانە پیاوبوون شتێکی خۆش بێت! حەز دەکەم ئەگەر کوڕ بووی و گەورە بووی، ئەو پیاوە بی کە هەمیشە لە خەیاڵەکانمدا وێنام کردوە! لە گەڵ لاوازەکان دڵنەرم و لە گەڵ زاڵمەکان توندوتیژ بی، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خۆشەویستی لە دڵیاندایە نەرم و نیان و لە گەڵ دەسەڵاتداران بێ بەزەیی بی! دوژمنی سەرەکیی ئەو کەسانە بی کە دەڵێن مەسیح کوڕی ئەو ژنە نییە، کە لێی لە دایک بوە!

بچکۆلەکە! هەوڵبدە تێبگەی پیاو بوون تەنیا ئەوە نییە کە زەقاییەکەت لە پێشەوە هەبێ! پیاو بوون یانی بۆ خۆت خاوەنی کەسایەتییەک بی! بە لای

منەوە گرینگە کە تۆ چۆن کەسایەتییەک دەبی! مرۆڤ بوون شتێکی زۆر جوانە، چونکە هیچ جیاوازییەک لە نێوان ژن و پیاودا دانانێت! دڵ و مێشکی مرۆڤەکان هیچ رەگەزێکیان نییە! هیچکات لە بەر ئەوەی پیاوی یان ژنی، بە زۆری زۆرداری داوات لێناکەم کە چ کارێک بکەی! تەنیا دوو شتم لە تۆ دەوێ: یەکێکیان ئەوەیە کە لە موعجیزەی لە دایکبوونت ئەوپەڕی کەڵک وەرگری و ئەوی تریشیان ئەوەیە کە هەمیشە کەسێکی بەکەڵک بی! بێکەڵکی وەکو گیانلەبەرێکی خوێن مژە کە هەمیشە لە سەر رێگامان لە بۆسە دایە! نینۆکەکانی بە بیانووی جۆراوجۆری وەکو مەسەڵەحەت و عەقڵ و پارێز، لە جەستەی هەموو مرۆڤەکان رۆ دەکات و کەمە کەسی واش کە بتوانێ لە بەرامبەریدا خۆڕاگری بکات! مرۆڤەکان کاتێک هەست بە مەترسیی دەکەن، بێکەڵک دەبن و کاتێکیش مەترسییەکە لە سەریان لاچوو، سەر لە نوێ دەچنەوە نێو کەوڵی خۆیانەوە! هیچکات نابێ لە کاتی بەرەو ڕوو بوونەوە لەگەڵ مەترسی، سەرت لێ بشێوێ، تەنانەت ئەگەر ترس سەرتاپێی جەستەشتی داگرتبێ!

لە دایکبوون خۆی مەترسییەکی هەیە! مەترسی پەژیوانی لە لەدایکبوون! رەنگە جارێ کاتی بیستنی ئەو قسانەت نەهاتبێ! لەوانەیە باشتر وابێ کە لە ناحەزیەکان و خەم و خەفەتەکان ئاگادارت نەکەمەوە و تەنیا باسی جیهانێکی رازاوە و جوان بکەم! بەڵام نامهەوێ کڵاو بنێمە سەرت و پێت بڵێم کە ژیان وەکو فەرشێکی نەرم وایە کە دەتوانی بە پێی پەتیش بە

سـەریدا بـڕۆی، نـا! ژیـان ڕێگایـەکی خـواروخێچی پـڕ کەندولەنـدە! ئـەو کەندولەندانـەی کـە بـە زەویـت دادەدەن و خـەڵتانی خوێنـت دەکـەن! ئـەو بەردانەی کە تـەنیا بە چەکمـەی ئاسنین دەکرێ بـە سـەریاندا بڕۆی! تازە ئەوەش هەموو شتێک نییە، چونکە کاتێـک قاچیشت داپۆشی، یـەکێک هـەر پەیدا دەبێ کە بەرد بە سەرت دابدات!

زۆر باشە! وانەی ئـەمڕۆمان تـەواو بـوو! کوڕەکـەم یـان کچەکـەم! خـۆ لەوانـە تێگەیشتی؟ خوا دەزانێ ئەگـەر خـەڵک گوێیـان لـە قسـەکانمان بێـت، چیمـان پێدەڵێن! پێتوانییە بە کەسێکی شێت و بێبەزەیی تاوانبارم بکـەن؟ لـە دوایـین وێنەتم دەڕوانی! لە ماوەی پێنج حەوتوودا باڵات بـە قـەدەر سانتیمەترێکیش نابێ! زۆر گـۆڕاوی! ئێستا لـە جیـاتی گـوڵێکی نەناسـراو، هـەر دەڵێـی کـەلووی (قۆزاخـەی کرمـی هاوریشـم)! وەکـو ماسـییەکی چکۆلـە کـە تـازە باڵـەکانی دەرکردوون! چواردانە باڵ کە دواتر دەبنە دەست و پێی تۆ! چاوەکانت وەکو دووخاڵی ڕەش لە نێو بازنەیەکدا دیارن و شتێکی زەقی چکۆلەشت هەیە! لە ڕۆژنامەدا نوسـراوە کـە لـەو تەمەنـەدا لـە گـەڵ بەچکـەی گیانلەبـەرانی دیکـە هیچ جیاوازییەکت نییە! یانی ئەگەر بەچکە پشیلەیەکیش بوایـەی هـەر بـەم شێوەیە دەبووی! نـە دەموچاوێـک، نـە مێشـکێک ... مـن لـە گـەڵت دەدوێـم و تۆش لێم تێناگەی! لە نێو تاریکیدا نوقم بووی و تەنانەت هەست بـە بـوونی خۆشـت ناکـەی! لـە دەسـتم دێ فڕێـت بـدەم و هیچکـاتێکیش نـازانی کـە

فڕێدراوی! هیچکات نازانی کە بە فڕێدانت چاکەم لە گەڵ کردووی یان زوڵمم لێکردووی.

***

دوێنێ باش نەبووم! ببورە کە سەبارەت بە فڕێدانت یان ئەوەیکە هیچ نازانی، لە گەڵت دوام! هەمووی هەر قسە بوو! ئەو بڕیارەی کە دابووم هێشتا هەر لە سەر جێی خۆیەتی! تەنانەت ئەگەر کەسانی دیکەش بە بیستنی واقیان وڕ بمێنێ! دوێنێ شەوێ کە لە گەڵ باوکت قسەم کرد! بە تەلەفوون لە بوونی تۆ ئاگادارم کردەوە! راستیەکەی هەر پێی خۆش نەبوو! سەرەتا چەند دەقیقەیەک بێدەنگ بوو و دواتر بێ ئەوەیکە هەر بۆشی گرینگ بێ، گوتی:

ـ چەندەی دەوێ؟

لە مەبەستەکەی تێنەگەیشتم ... گوتم:

ـ رەنگە نۆ مانگ! یان هەشت مانگ!

گوتی:

ـ خەریکم باسی خەرجەکەی دەکەم!

ـ خەرجی چی؟

ـ خەرجی خۆدەربازکردن لە چنگانی!

بەڵێ! ڕێک هەر ئەو ڕستەیەی بەکار هێنا! هەر وا وێدەچوو کە تۆ هیچ جیاوازییەکت لە گەڵ زبڵەکە نەبێ! زۆر بە هێواشی پێمگوت کە تۆ لەناو نابەم! بە دەنگێکی سەیر کە هێندێک جار وەکو نەسیحەت بوو، هێندێک جاریش وەکو بڕیاری لێدەهات و جاری واش هەبوو کە شێوازی پاڕانەوەی بە خۆیەوە دەگرت، دەیهەویست تێمبگەیەنێت کە بە هەڵەدا دەچم! بە تایبەت لە بەر ئەوەیکە ئەو نایهەوێ لە گەڵم بژیت! هەر دەیگوت:

ـ بیر لە کارەکەت بکەوە! لە بەرپرسیارێتییەکەت! لە قسەی خەڵک!

من وەڵامم نەدەدایەوە و ئەویش پێیوابوو بێدەنگیم نیشانەی ڕەزایەتمە! لە دواییشدا گوتی نیگەرانی خەرجەکەی نەبم و ئەو حازرە نیوەی پارەکە بدات!

حاڵم تێکچوو! هەستم دەکرد هێندەی نەماوە بە سەر تەلەفۆنەکەدا بڕشێمەوە! ئامێری تەلەفۆنەکەم لە سەر جێگاکەی دانایەوە و بیرم لەوە دەکردەوە کە سەردەمانێک ئەو پیاوەم خۆش ویستوە! خۆشم دەویست! من و تۆ ڕۆژێک دەبێ سەبارەت بەم خۆشەویستییە قسە و باسێک بکەین! ئەوەی ڕاستی بێ، من هێشتاش نەمزانیوە مەبەست لە عەشق چییە؟ واپێدەچێ کە عەشق فێڵ و تەڵەکەیەکی گەورە بێت کە بۆ ڕابواردنی

خەڵکی دروست کراوە! چاوت بە هەر کەسێک دەکەوێ هەر لە عەشق دەدوێ: قەشەکان، ریکلامەکان (پڕوپاگەندە)، نووسەرەکان، کەسانی سیاسی و سەرەنجام ئەوانەش کە هەر بە راستی خەریکی عەشق و عاشقین! من رقم لە وشەی عەشقە کە لە هەموو شوێنێک و لە سەرجەم زمانەکاندا بۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵک!

حەزم لە رێکردنە! حەزم لە خواردنەوەیە! حەزم لە جگەرەیە! حەزم لە ئازادییە! دۆستەکەمم خۆش دەوێ! منداڵەکەشم خۆش دەوێ!

هەوڵدەدەم هیچکات وشەی" خۆشم دەوێی" بە کار نەهێنم و هیچکات بە خۆم نەڵێم ئەو شتەی کە دڵ و روحمی داگیر کردوە، عەشقە! نازانم تۆم خۆش دەوێ یان نا؟ من بە تەنیا بە هەستی عاتیفەی ژیانەوە لە تۆ دەڕوانم، نەک بە عەشق! هەرچی بیر دەکەمەوە دەبینم کە هیچکات باوکیشتم خۆش نەویستوە! ئەوم دەویست و هەمیشە باسی چاکەی ئەوم دەکرد، بەڵام خۆشم نەدەویست! سەرجەم کەسەکانی پێشووتریش تەنیا سێبەری گەڕانێک بوون کە بەردەوامیش شکست هاوڕێیان بوە! ژیان لە گەڵ باوکت لەوەی تێگەیاندم کە هیچ شتێک بە قەدەر هۆگریی پیاو بۆ ژن و یان هۆگریی ژن بۆ پیاو هەڕەشە لە ئازادیی مرۆڤ ناکات! هیچ زنجیر و تەنافێک ناتوانێ تۆ وەکو کۆیلەیەکی بەندکراوی بێ هیوا بەند بکات! جا چ بگات بە کەسێک کە خۆی هەر بۆ ئەو هۆگرییە بە دیاری بدات بە

کەسێکی تر! بەمکارە خۆمانمان لە بیر دەچێتەوە و تەواوی ماف و ئازادیەکەمان لە دەست دەدەین! وەکو سەگێک کە لە دەریا کەوتبێ و پەلەقاژە دەکات هەتا خۆی بگەیەنێتە ئەو کەنارەی کە بوونی نییە!

کەنارێک بە ناوی خۆشەویست بوون و مەعشوقی کەسێکی دیکە! ئەگەریش بەو کەنارە بگەی تازە لە خۆت پرسیار دەکەی: کە بۆچی خۆت فڕێداوەتە ناو ئاوەکەوە؟ چونکە لە خۆت رازی نەبووی و ئەوە نەبووی کە دەتهەویست؟ یان بە هۆی مەترسیی بێدەنگی و تەنیاییەوە؟ لەوانەیە پێویستیت بەوە هەبێ کە کەسێک داگیر بکەی یان کەسێک داگیرت بکات؟ هێندێک کەس بەوە دەڵێن عەشق! بەڵام بەڕای من عەشق زۆر لەوە کەمترە کە بۆم باسکردی! وەکو چەشنێک برسێتییە کە دوای تێربوون قورساییت لە سەر دەکات و تێکت دەدات! دواتریش نۆرەی دڵ تێکەڵهاتنە! بۆچی هیچکەسێک و هیچ شتێک نەیتوانی من لە مانای ئەو وشەیە تێبگەیەنێت؟ زۆر حەز دەکەم لە ماناکەی تێبگەم! تینووی تێگەیشتن لە ماناکەیم! هێندێک جار دەڵێم رەنگە هەر ئەو شتە بێ کە دایکم پێی دەگوتم! یانی هەستێکی دایکانە کاتێک کە دایک منداڵەکەی لە باوەش دەکات! لانیکەم تا کاتێک کە منداڵەکە چکۆلەیە و جنێوت پێنادات و ناتوانێ ئازارت بدات! ئەگەر داوا لە تۆ بکەم، لە تۆ کە منت لە خۆم بەتاڵ کردوە و خوێنم دەمژی، کە سێ پیتی عەین و شین و قاف بۆ مانا بکەیەوە، چیم پێدەڵێی؟

له نێوان من و مرۆڤه عاشقەکاندا خاڵێکی هاوبەش هەیە! ئەوان بە روانین له وێنەی خۆشەویستەکەیان هێور دەبنەوە و منیش هەروا! هەمیشە وێنە جوانەکانت لە نێو دەستمدان! هەستیار بوومەتەوە! کاتێک کە ماندوو و هیلاک دێمەوە ماڵەوە بە شوێن تۆدا دەگەڕێم و رۆژنامەکان لە سەر زەویەکە بڵاو دەکەمەوە و رۆژەکانی تەمەنت دەژمێرم! ئەمرۆ شەش حەوتوو له بوونت تێپەڕیوە! چەندە جوانی! ئیتر نە گوڵی و نە کەلووی! بە سەره زەلام و تاسەکەتەوە وەکو مرۆڤت لێهاتوە! مۆرەغەکەی پشتت جوان دیارە! دەستەکانت ئیتر وەکو باڵی ماسی نین! دوو باڵن! باڵت لێ رواوە! حەز دەکەم هەم جەستەت و هەم دوو باڵەکەشت بلاوێنمەوە! ژیان لەو هێلکەیەدا چۆنە؟ لە وێنەکانتا دەردەکەوێ کە لە وێدا سەراو کەوتووی! وەکو ئینجانەیەکی شوشەیی کە گوڵێکی سووریان تێ هاویشتوە!

هەودایەک لە هێلکەکە جیا بۆتەوە کە دەگاتە ئەو ئینجانە سپییەی کە دەماری سوور و خاڵی بۆری تێدایە! دەڵێن گۆی زەویش لە دووریی چەند کیلۆمەترییەوە هەر بەو شێوەیە! هەر بە راستی واپێدەچێ حەبلێک کە وەکو ژیان درێژە، لە زەویەوە بەرەو لای تۆ هاتبێت! چۆن دڵیان دێ کە بڵێن پێکهاتنی مرۆڤ بە رێکەوت بوە؟

دوکتۆر گوتی کە دوای تەواو بوونی شەش حەوتوو سەر لە نوێ بچمەوە لای! سبەینێ دیسانەوە دەبێ بچمەوە بۆ لای! هێندێک جار ترس و هێندێک جاریش خۆشحاڵی دامدەگرێ!

دوکتۆرەکە کە خەریک بوو لە کاغەزی سەر مێزەکەی دەڕوانی، بە چەشنێک کە هەوڵیدەدا خۆشحاڵ و میهرەبان بێ گوتی:

ـ خانم! پیرۆز باییت لێدەکەم!

هەر خێرا قسەکەیم راست کردەوە:

ـ خانم نا، گەورەکچ!

دەتگوت زللەیەکی چاکم لە بناگوێچکەی داوە! خۆشحاڵی و میهرەبانی بە روخساریەوە نەما! زۆر بە بێوازیی گوتی:

ـ ئەها!

دواتر خەتێکی بە سەر خانمەکەدا هێنا و نووسی: گەورە کچ! بەم چەشنە بوو کە لە ژوورێکی سپیدا پیاوێکی سپی پۆش بە شێوەیەکی فەرمی منی لە بوونی تۆ ئاگادار کردەوە! سەری سوڕما لەوەیکە ناوەکەی خۆمم لە سەر کاغەزەکەی راست کردەوە! کاتێک پێی گوتم کە رووت ببمەوە و لە سەر قەرەوێڵەکە راکشێم، زۆر بە میهرەبانی قسەی دەکرد! بە بیستنی قسەکەی

زۆر نەپەشۆکام! بۆ خۆم دەمزانی تۆ لەوێی! دوکتۆر و هاوکارەکەشی هەر لە سەروچاویان نەدەڕوانیم! هەر دەتگوت پشکنین بۆ گیانلەبەرێکی مەترسیدار دەکەن! بەڵام بە چاو یەکتریان لە هێندێک شت تێدەگەیاند!

کاتێک لە سەر قەرەوێڵەکە راکشام، هاوکاری دوکتۆرەکە زۆری پێ ناخۆش بوو چوونکە بە باشی لینگم لێک نەکردبوونەوە و لە شوێنێکی باشیشم دانەنابوون! بە زۆری لینگی لێک کردمەوە و گوتی:

ـ یەکێکیان لێرە دابنێ و ئەوی دیکەشیان لە وێ!

ئەو کات هەستم بەوە کرد کە تەنیا کوتە گۆشتێکم و هیچی تر! چەند دەقیقە دواتر بەشی مەترسیداری رووداوەکە دەستی پێکرد: دوکتۆرەکە دەستکێشە لاستیکیەکانی لە دەست کردن و دەستی کرد بە پشکنینی جەستەم! ئێشی زۆر بوو! وامزانی دەیهەوێ بتخنکێنێ! ئاخرەکەی دەستکێشەکانی لە دەستەکانی دەرهێنان و گوتی:

ـ هەموو شتێک باشە، هەموو شتێک ئاساییە!

خێرا کاغەزێکی بۆ دەواو دەرمان نووسی و وەکو توتی دەستی کرد بە قسەکردن و گوتی کە دووگیانی نەخۆشی نییە و پێی گوتم دەتوانم هەر ئەو کارانەی کە پێشووتر کردوومن، ئێستاش بیانکەم! تەنیا دەبێ زۆر جگەرە نەکێشم و بە ئاوی زۆر گەرم خۆم نەشۆم و بیر لە جینایەت نەکەمەوە!

پرسیم:

ـ جینایەت؟

ـ بەڵێ! هەڵبەتە خۆ دەزانی کە دەوڵەت ئەم کارەی قەدەغە کردوە!

بۆ ئەوەیکە هەڕەشەکانی کاریگەری خۆیان دابنێن حەبی (ڕۆتئین)ی بۆ نووسیم و داوای لێکردم هەر پازدە رۆژ جارێک سەردانێکی بکەم! دواتر گوتی حەقی ویزیت (پسووله)کەش بدەم بە سکرتێرەکە و لە کاتی گوتنی تەواوی ئەو قسانەدا تەنانەت بزەیەکیشی نەهاتێ! هاوکارەکەشی هیچ روویەکی خۆشی نەدامێ و کاتێک دەرگاکەم پێوە دایەوە چاوم لێ بوو کە هەر دووکیان بە خەفەتەوە سەریان دەلەقاند!

دەترسم تۆ لە گەڵ ئەو شتانە رانەیەی! ئەو جیهانەی کە بڕیارە تێیدا چاوت بە ژین بپشکوێ ـ سەرەڕای ئەو قسانەی کە سەبارەت بە گۆڕانی زەمەن دەیکەن ـ بە ژنێک کە بە بێ هاوسەرگیری منداڵی ببێ، پێی دەڵێن بەرەڵڵا! لە باشترین حاڵەتیشدا ئەو وەکو قارەمانێک نێو دەبەن و پێی هەڵدا دەڵێن! بەڵام هیچکات بە چاوی ژنێکی ئاسایی لێی ناڕوانن! ئەو دەرمانفرۆشەی کە حەبی رۆتئینەکانی پێ فرۆشتم پێشووتریش منی دەناسی و دەیزانی کە هاوسەرم نییە! کاتێک کە چووم ئەو دەوا و دەرمانانە وەربگرم کە دوکتۆرەکە نوسیبوونی، نێوچاوانی گرژ کرد و بە سەر سووڕمانەوە لێی

روانیم! دواتر چوومە لای بەرگدروەکەم بۆ ئەوەی باڵتۆیەکم بۆ بدوریت! زۆری نەماوە بۆ زستان و نامهەویٚ تۆش سەرمات بیٚت! لە کاتێکدا کە هێندێکی دەرزی بە دەمەوە گرتبوون، دەستی بە قیاس کردنم کرد! کاتێک گوتم کە لە بەر دووگیانیم با باڵتۆکە هێندێک گەورەتر بیٚ چونکە سکم وردە وردە گەورە دەبیٚ، لە خەجاڵەتییان سوور هەڵگەڕا! وا حەپەسابوو کە ترسام دەرزییەکان بە گەرویدا رۆبچنە خوارەوە! بەڵام دەرزییەکان بەر بوونەوە سەر زەوی و مەترەکەش لە دەستی داکەوت و منیش بەم قسانەم سەرم لیٚ شێواند، پەژیوان بوومەوە! لە پەیوەند لە گەڵ بەرپرسەکەشم هەر ئەو شتە رویدا! بە هەر حاڵ چونکە بەرپرسی منە و مانگە و مانگ پارەم دەداتیٚ جوان نییە کە پێی نەڵێم تا چەند مانگێک ناتوانم کار بکەم! بە مەبەستی باسکردنی ئەو قسەیە چوومە ژوورەکەیەوە! تۆزێک بێدەنگ بوو! دواتر وەخۆی هاتەوە و بە پرتەپرەت گوتی کە رێز لە بڕیارەکەم دەگریٚ! گوتم من زۆر بە جەرگم بەڵام باشتر وایە کە هەموو کەس لەم روداوە ئاگادار نەکەمەوە!

ــ باسکردنی ئەم بابەتە لە نێو خۆماندا شتێکە و باس کردنیشی لای کەسانێک کە دەرکت ناکەن، شتێکی دیکەیە! لەوانەشە تا چەند رۆژێکی تر لە بڕیارەکەت پاشگەز ببیەوە! وایە یان نا؟

له سەر ئەوەیکە لە بڕیارەکەم پاشگەز ببمەوە زۆر جەختی کردەوە! گوتی هەتا سێ مانگ کاتم بە دەستەوەیە بیر بکەمەوە و بڕیارێک بدەم کە بیسەلمێنێ کەسێکی تێگەیشتووم! گوتی کارەکەم زۆر باشە و حەیفە لە بەر ئەوە دەست بەرداری بم! ئەو گوتی زۆر زیاتر لە چەند مانگ و تەنانەت ساڵێکیش دەخایەنێ و ڕێڕەوی ژیانم دەگۆڕێ! مەبەستی ئەوە بوو کە بە بوونی تۆ، من ئیتر ئەو کەسە نامێنم و ناتوانم وەکو پێشووتر کار بکەم! ئەوەشمان لە بیر نەچێتەوە کە کۆمپانیاکەی ئەو منی کردبوە کەسێکی ناسراو و حیسابی لە سەر دەکردم! کۆڵێک بەرنامەی بۆ داهاتووم لە بەر چاو گرتبوو! ئەگەر لە بڕیارەکەم پاشگەز ببومایەوە دەبوایە ئاگاداری بکەمەوە و داوای یارمەتی لێبکەم!

باوکت سەر لە نوێ تەلەفۆنی کردەوە! دەنگی دەلەرزی و دەیهەویست بزانێ کە وەڵامی پشکنینەکە ئەرێ بوە یان نەرێ؟ گوتم کە ئەرێ بوە! بۆ جارێکی دیکەش پرسیاری ئەوەی کرد کە کەی بە تەمام بە قەولی خۆی کارەکە جێبەجێ بکەم! بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەم تەلەفۆنەکەم داخستەوە!

ئاخر بۆچی ئەگەر کەسێک بە شێوەی ئاسایی دووگیان دەبێت، خێرا جەژنی بۆ دەگرن و داوای لێدەکەن کە خۆی هیلاک نەکات و پێیدەڵێن کە دووگیانی کارێکی زۆر باشە، بەڵام سەبارەت بە من هەموان بێدەنگ دەبن و باس لە لەبار بردنی کۆرپەلەکە دەکەن؟ هەمووان خەریکی پیلانگێڕین بۆ

ئەوەی من و تۆ لە یەکتر جیا بکەنەوە! هێندێک جار نیگەران دەبم و لە خۆم دەپرسم: ئاخرەکەی کێ دەیباتەوە؟ ئێمە یان ئەوان؟

ڕەنگە نیگەرانییەکەم هی زەنگەکانی ئەم تەلەفۆنە بێت! ئەو تاڵی و ناڕەحەتیانەی کە لە بیرم چووبوونەوە بە زەنگی تەلەفۆنەکە وەبیرم دێنەوە! ئەو ناڕەحەتیانەی کە لە کۆمەڵێک خەیاڵ پڵاوی خۆش دروست ببوون و منیان لەوە تێگەیاند کە عەشق تەنیا شانۆیەکی ئاڵۆزە! برینەکان چاک دەبنەوە و شوێنەکانیشیان وردە وردە لە ناو دەچێت بەڵام زەنگێکی تەلەفۆنەکە بەسە بۆ ئەوەی تەواوی ئێش و ئازارەکان بگەڕێنەوە سەر جێگای خۆیان! ئازاری شکستە کۆنەکان لە کاتێکدا کە زەمەن هەروا بەرەو پێش دەچێت!

***

جیهانی تۆ هەر ئەو کیسەیە کە شەش حەوتوویە تێیدا هەڵترۆشکاوی و سەر ئاو کەوتووی! بەو کیسەیە دەڵێن کیسەی جنینی! ناوەکەی پڕە لە ئاوێکی سوێر کە ناهێڵێ تووشی هێزی راکێشان ببی وجموجۆڵەکانی من بەملاو لات دابدات! هەتا چەند رۆژ لە مەو بەریش هەر پێویستی خۆراکیی خۆت لەم کیسەیە دابین دەکرد! دوای هێندێک رووداوی سەیر و سەمەرە، تۆ نەختێک لەو شتە ئاوەکیەت دەخواردەوە، بڕێکی تێکەڵاوی جەستەت دەبوو و بەو شتەش کە دەرت دەدایەوە سەر لە نوێ ئەو شتە ئاوەکیەت دروست دەکردەوە! ئێستا چوار ڕۆژە کە لەڕێگای ناوکتەوە بە منەوە پەیوەند

دراوی و خواردەمەنیت لە منەوە دابین دەکەی لەم چەند ڕۆژەدا زۆر شت ڕویانداوە کە من بە خاتری ئەوان سپاسی تۆ دەکەم ! ئەو شوێنەی کە هێلکەکەی لە خۆیدا ڕاگرتووە زۆر توندبووە! خانەکانی ناو خوێنت بەردەوام زیاتر دەبن هەمووی ئەوانە خەریکە بە خێراییەکی سەیرو سەمەرەوە روو دەدەن! شەبەکەی دەمارەکانت ئیتر دەبیندرێ ! دەمارەکانت و ناوکیشت کە من و تۆی پێکەوە پەیوەند داوە، توندو تۆڵتربووە! سپەلاکیشت بە تەواوی هەڵاوساوە و سەرجەم ئەندامەکانی تریشت خەریکن دێنە سەر شێوازی خۆیان ! ئەندامی زاوزێشت چەکەرەی داوە! ئێستا ئیتر خۆت دەزانی کە کچی یان کوڕ! بەڵام کۆرپەلە! ئەوەیکە لە هەموو شتێک زیاتر پێم خۆشە ئەوەیە کە دەستەکانت هاتوونەتە سەر شێوازی خۆیان! قامکەکانت دەرکەوتوون! دەمێکی چکۆلە و لێوێکت هەیە! زمانیشت ڕواوە! جێگەی بیست دانە ددانیشت دیارە! سەرەڕای ئەوەیکە چکۆلەی دوو چاویشت هەیە! دوو چاو کە کێشەکەیان لە سێ گرەم زیاتر نییە! ناتوانم باوەڕ بکەم کە سەرجەمی ئەوانە لە ماوەی چەند حەوتوودا دروست بوون! بەڕای من زۆر ئاسایی نییە! بەڵام دەسپێکی جیهانیش هەر دەبی ئاوا بووبێ! بزووتنێک، ئاوسانێک ... دەسپێکی ژیان! بێ کۆتایی و ئاڵۆز، بێ کۆتایی و دژوار ،بێ کۆتایی و خێرا و ڕێک و پێک و کامڵ ...

ئەو هەموو جموجۆڵەت لە چییە! کۆرپەکە! کێ دەڵێ لە لانکە ئاویەکەتدا خەوتووی؟ تۆ هیچکات ناخەوی وئارام نابیتەوە! کێ گوتوویەتی تۆ لە ئارامیدای؟ کێ گوتوویەتی تۆ ئارامی و تەنیا لایەلایەیەکی جوان لە دەنگە نەرم و نیانەکانی دەوروبەرت دەبیستی؟

دەزانم بەردەوام خەریکی جموجۆڵ و هەناسەدانی خێرا خێرای و دەنگە دەنگێکی بەرزیشت لێوە دێت! کێ گوتوویەتی تۆ گیانت لەبەر نیەو وەکو گیایەک دەکرێ بە کەوچک لە ژێر گڵ دەرت بێنن!

پێم دەڵێن ئەگەر بمهەوێت لە چنگانت ڕزگار بم، ئێستا کاتیەتی! یانی دەبێ ڕاوەستم تا ببیتە مرۆڤێکی خاوەن چاو و دەست و دەم، هەتا بتکوژم، نەک بەر لەوە! پێشووتر تۆ چکۆلە بووی بە هاسانی نەدەدۆزرایەوە و نەدەکرا بکوژرێی!

ئەوان هەموویان شێتن!

***

هاوڕێکەم لە سەر ئەو بڕوایەیەکە من شێتم! ئەو زەواجی کردوە و لەم سێ ساڵەی دواییدا چوار منداڵی لە بار بردووە! دوو منداڵی هەیە و نایهەوێ سێهەمیشیان لە دایک ببێ! داهاتی هاوسەرەکەی کەمە و خۆیشی کار دەکات و ناشیهەوێ کارەکەی لە دەست بدات چونکە حەزی لە کارەکەیەتی! خەسووی بە منداڵەکانی ڕادەگات چونکە خۆی بە تەنیایی ناتوانێ ڕەوزەیەک بەڕێوە بەرێ! لە دایکبوونی منداڵ شتێکی زۆر شاعیرانەیە، بەڵام بەڕای هاوڕێکەم، ڕاستیەکە شتێکی دیکەیە، ئەو دەڵێ:

ـ تەنانەت مریشکەکانیش لە قەدەر توانای خۆیان جووجەڵە هەڵناهێنن! ئەگەر هەر هێلکەیەک جووجەڵەیەکی هەڵێنابا، دونیا دەبووە هێلانە مریشک! مەگەر نازانی کە هێندێک لە مریشکەکان، هێلکەکانی خۆیان دەشکێنن و

دەیانخۆن؟ مەگەر نازانی لە ساڵێکدا تەنیا یەک دوو جار لە سەر هێلکە هەڵدەنیشن؟ تەنانەت کەروێشکەکانیش بەچکە کز و لاوازەکانیان دەخۆن هەتا ئەوانی دیکە چاکتر بەخێو بکەن! بەڕای تۆ باشتر نییە هەر لە سەرەتاوە نەهێڵن ببن نەک ئەوەیکە بێڵن چاویان بە ژین بپشکوێ و دواتر بخورێن؟

من پێم گووت باشتر وایە کە هەر هیچ منداڵێک دروست نەکەن! بەڵام ئەو ئەم قسەیەی منی بە دڵ نەبوو و باسی لەوە کرد کە هەموو شەوێک حەبی دەخوارد بۆ ئەوەی دووگیان نەبێ! حەزی لەم کارە نەبووە، بەڵام هەموو شەوێک حەبی خواردوە! هەتا شەوێکیان کە لە بیری دەچێتەوە حەبەکەی بخوات و هەر ئەوەش دەبێتە هۆی کەوتنەوەی منداڵی یەکەمیان و بە سۆندێک(sonde ) منداڵەکەیان لە ناو بردبوو! من ئەو کات بە باشی نەمدەزانی کە ئەو سۆندە چیە! پێموابوو میلەیەکە کە منداڵەکەی پێ دەکوژن! دواتر زانیم کە زۆربەی ژنان سەرەڕای ئەوەیکە دەشزانن کە ئێش و ئازاری زۆرە و لەوانەیە لە سەریشی زیندانیی بکرێن، بەڵام هەرکەڵکیشی لێ وەردەگرن!

تا ئێستا لە خۆتت پرسیوە کە بۆچی چەند رۆژێکە تەنیا هەر سەبارەت بەم شتانە لە گەڵت دەدوێم؟ بۆ خۆشم نازانم! رەنگە لە بەر ئەوە بێ کە کەسانی دیکە هەتا رادەی ئەشکەنجەدان لەمبارەیەوە لەگەڵم دەدوێن، بەڵکو بتوانن رازیم بکەن! رەنگە لە بەر ئەوە بێ کە خۆشم بیر لەوە دەکەمەوە! رەنگە لە بەر ئەوە بێ کە نامهەوێ هیچکەسێک بەشداری ئەو هەڕەشەیە بێت کە لەگیانم بەربوە! بیری کوشتنەکەی رۆژگارم بە فیڕۆ دەدات، بەڵام دیسانیش بیری لێدەکەمەوە! ئەو قسانەی کە سەبارەت بە مریشکەکان

بیستمن، لە زەینم ناسڕێنەوە، هەروەها سەروچاوی تووڕەی هاوڕێکەم کاتێک کە وێنەکانی تۆم پیشانی ئەو دەدا و ئاماژەم بە دەستەکان و چاوەکانت دەکرد! ئەو پێی گوتم کە چاوو و دەستەکانی تۆ بە میکرۆسکۆپیش نابیندرێن و من لە ناو خەیاڵاتدا دەژیم! ئەو پێیوایە من وەکو شتێکی راستەقینە دەڕوانمە خەیاڵەکانم و پێی گوتم:

ـ ئەی بۆچی بەچکە بۆقەکان لە گۆمیماڵەکەت دێنیە دەرێ هەتا نەبنە بۆق و شەوانە بە قڕەقڕ وە ئەمانت نەهێنن؟

دەزانم کە بەردەوام خەریکم بۆت باسی ناحەزیەکانی جیهانێک دەکەم کە بڕیارە پێی تێ بنێی و لەو کارە ناحەزانەی کە رۆژانە پێیەوە خەریکین، ئاگادارت دەکەمەوە! دەزانم تێگەیشتنی ئەو شتانە بۆ تۆ کارێکی هاسان نییە بەڵام هێندێک شت وردەوردە تێمدەگەیەنن کە تۆ لە هەموو قسەکانم حاڵی دەبی! ئەو شتە لە رۆژێکەوە دەستی پێکرد کە هەوڵم دەدا تێتبگەیەنم کە گۆی زەوی هەر وەکو ئەو هێلکە کە تۆ لێی هاتویە دەرێ، خڕە و دەریاش هەر لە شتێکی وەکو ئەوە دروست بوە کە تۆ تێیدا سەرئاو کەوتبووی! دەمهەویست لەوانەت تێبگەیەنم بەڵام نەمدەزانی بە چی شێوەیەک! لە ناکاو زانیم کە لە خۆڕا گوشار دەخەمە سەر خۆم، چونکە خۆت هەمووی ئەوانە لە من باشتر دەزانی! لە تێگەیشتنی ئەم بابەتە وڕ بووم و هەتا ئەم ساتەوەختەش پێموایە گومانەکەم راست بوە! ئەگەر لە هێلکەیەکدا کە تۆی لێ بەرهەم هاتووی، یەک دنیای تێدایە، ئەی بۆچی دەبێ نەکرێ کە هەر لەو دونیایەدا بیر بکەیتەوە؟ مەگەر ناڵێن کە شتەکانی ویژدانی نائاگا هەر بیرەوەریەکانی ژیانن بەر لەوەی پێ بنێیتە رووناکییەوە؟ بە راستی ئاوایە؟

کەوایە تۆ کە هەموو شتێک دەزانی، پێم بڵێ کە ژیان لە کوێوە دەست پێدەکات؟ پێم بڵێ! تکات لێدەکەم! بڵێ تۆ دەستت پێکرد! لە کوێ را؟ هەر لەو کاتەوە کە دلۆپێک نوور کە پێی دەڵێن ئێسپێرماتۆزۆئید، هێلکەکەی کوون کرد؟ لەو کاتەوە کە دڵت پێک هات و دەستی کرد بە ناردنی خوێن! لەو کاتەوە کە مێشکت دروست بوو و وەکو مرۆڤت لێهات! رەنگە هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبێ و تۆش وەکو ماتۆڕێک وای کە خەریکن کوت و لەتەکانی لە سەر یەک دەنێن؟

ئامادەم دارونەدارەکەم بدەم بۆ ئەوەی تۆ ئەو بێدەنگییە بشکێنی و لەو زیندانە تێبگەم کە تۆ لە ناویا خۆت حەشار داوە و من دەرگاوانەکەیم! ئامادەم دارونەدارەکەم بدەم و بتبینم و گوێم لە دەنگت بێت! ئێمە پێکەوە جووتێکی زۆر سەیرین! هەموو شتێکی تۆ پەیوەندیی بە منەوە هەیە و هەموو شتێکی منیش پەیوەندیی بە تۆوە هەیە! ئەگەر تۆ نەخۆش بی، منیش نەخۆش دەکەوم و ئەگەر من بمرم تۆش دەمری! سەرەڕای هەمووی ئەوانەش نە من دەتوانم ئاوێتەت بم و نە تۆش دەتوانی! سەرەڕای ئەوەیکە لە جیهانەکەی خۆتدا عەقڵێکی تەواوی، بەڵام هەر نازانی کە شکڵ و شێوازی من چۆنە و تەمەنم چەندە و بە چ زمانێکیش دەدوێم! تەنانەت ئەگەر زۆریش گوشار بخەیتە سەر مێشکت، دیشانیشەوە ناتوانی لەوە تێبگەی من سپیم یا خود رەشم، لاوم یان پیر، بالابەرزم یان کورتە بالا، هێشتاش لە خۆم دەپرسم تۆ کەسێکی یا خود نا!

هیچکات دوو کەسی غەریب لە کاتێکدا کە یەک چارەنوسیان هەیە بە قەدەر ئێمە لە یەک بێ ئاگا نەبوون!

هیچکات دوو کەسی نەناسیاو کە هەردووکیان یەک جەستەیان هەیە بە قەدەر ئێمە لە یەکتر دوور نەبوون!

خراپ خەوم لێکەوت دڵم ژانی دەکرد! یانی تۆ بووی؟ بە دڵەڕاوکێیەوە لە سەر تەختی نوستنەکەم پێچم لە خۆم دەدا، خەوەکەم پڕ بوو لە خەونی ئاڵۆز! لە یەکێک لەو خەونە ئاڵۆزانەمدا باوکت خەریک بوو هاواری دەکرد و وەزعی باش نەبوو! هیچکاتێک گریانی ئەوم نەبینیبوو و گومانم نەدەکرد بتوانێ بگری! فرمێسکەکانی وەکو دڵۆپی فلزی قاڵبۆوە دەڕژانە نێو حەوزەکەوە! هەموو حەوزەکە بە تویژاڵی لیج و درێژ داپۆشرابوو! هەموو تویژاڵەکانیش هێلکۆکەیەکی چکۆڵەیان پێوە بوو! ئەوان بەچکە بۆق بوون! هیچ کارێکم بە باوکت نەبوو، تەنیا لە بیری کوشتنی بەچکە بۆقەکاندا بووم! نەمدەویست ئەوان ببنە بۆق و بە قیڕەقیڕەکەیان خەوم بزڕێنن! کارێکی هاسان بوو! هەر دەبوایە تویژاڵەکان هەڵگری و لە سەر چیمەنەکە بڵاویان بکەیەوە هەتا خۆرەتاوەکە وشکیان بکاتەوە! بەڵام تویژاڵەکان دەئاڵۆزان و سەرلەنوێ دەچوونەوە نێو قەوزەی حەوزەکەوە! نەمدەتوانی لە سەر چیمەنەکەیان دابنێم! ئاخرەکەی باوکت گریانەکەی تەواو بوو و هاتە یارمەتیم! ئەو زۆر بە هاسانی دەیتوانی ئەو کارە بکات! بە لقە دارێک تویژاڵەکانی لە ئاوەکە دەردێنان و لە سەر چیمەنەکە کۆی دەکردنەوە! کارەکەی بە وردی و لە سەرخۆیی دەکرد! من نیگەران بووم! پێموابوو شایەتی مردن و خنکانی بە هەزاران کۆرپەم! لقە دارەکەم لە دەستی باوکت دەرهێنا و هاوارم کرد:

ـ لێیانگەڕێ با بە زیندوویی بمێننەوە! تۆش ڕۆژێک لە ڕۆژان لە دایک بووی! وانییە؟

لە خەونێکی دیکەدا چاوم بە کانگوڕویەک کەوت! کانگوڕویەکی مێ بوو کە شتێکی نەرم و زیندوو لە منداڵدانی دەهاتێ دەرێ! کرمێکی زۆر نەرم! بە سەرسووڕمانەوە لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی دەیویست بزانێ لە کوێیە؟ دواتر بە جەستەی پەشمینی کانگوڕوەکە هەڵگەڕا! لە سەرخۆ سەردەکەوت! هیلاک دەبوو، هەڵدەخلیسکا، هیلاک دەبوو، ڕێگەی لێ ون دەبوو ... بەڵام سەرەنجام خۆی گەیاندە کیسەکەی دایکی! هەموو هەوڵی خۆی خستە گەڕ و بە سەرەوە چوە ناو کیسەکەی دایکییەوە! تێگەیشتم کە ئەو وەکوو تۆ نییە! ئەو بەچکە کانگوڕویەک بوو! ئەوان زوو لە دایک دەبن و لە کیسەی دایکیاندا گەورە دەبن! لە گەڵی دەدوام! هەر دەتگوت ئەو بەچکە کانگوڕویە تۆ بووی! سوپاسم کرد بۆ ئەوەی پیشانیدام کە گیانلەبەرە نەک شتێکی بێ گیان! پێمگوت ئیتر پێکەوە غەریبە نین و لە خۆشیان پێکەنیم! زۆر پێکەنیم ... بەڵام لە ناکاو پیرە ژنێک گەیشتە ئەوێ! زۆر پیر و خەمین بوو! دەتگوت قورسایی هەموو جیهان لە سەر شانی ئەوە! منداڵێکی تازە لە دایکبووی بە دەستە چرچەکانی هەڵگرتبوو کە چاوی نەپشکوتبوون و سەریشی لە قەدەر جەستەی نەبوو! پیرە ژنەکە گوتی:

ـ چەندە هیلاکم! کۆڵێک پارەم خەرجی لە بار بردنی کرد! هەشت منداڵم بوە و هەشت جاریش کۆرپەلەکانم لە بار بردون! ئەگەر دەوڵەمەند بوایەم دەمهێشت هەموو منداڵەکانم ببن و ئێستا شازدە منداڵم هەبوو! هەموو

جارێک کە دووگیان دەبم هەر وەکو جاری یەکەمە! بەڵام قەشەکان لەو شتانە تێناگەن!

منداڵەکە لە نێو دەستەکانیدا هەر بە قەدەر ئەو خاچە چکۆلانەیە بوو کە ئیمانداەکان هەمیشە لای خۆیان هەڵیدەگرن! پیرەژنەکە هەر بەو شێوەیەی کە منداڵەکەی وەکو خاچێک بە دەستەوە گرتبوو، چووە ناو کڵێسەکە و دوای ئەوەیکە لە بەردەم یەکێک لە شوێنەکانی دان پێدانان بە خراپەکاریەکانیدا، لە بەر خۆیەوە دەستی کرد بە ورتە ورت! لە نێو ژوورەکە هاواری قەشەیەک بەرز بۆوە:

ـ تۆ گیانلەبەرێکت کوشتوە! تۆ گیانلەبەرێکت کوشتوە!

پیرەژنەکە لە ترسی ئەوەیکە نەکا کەسانی دیکە گوێیان لە قسەکانی قەشەکە بێت، لە بەرخۆیەوە دەیگوت:

ـ هاوار مەکە! باوکی پیرۆز! تکا دەکەم! کارێک مەکە من بخەنە زیندانەوە!

بەڵام قەشەکە بەردەوام هەر هاواری دەکرد! پیرەژنەکە هەستایە سەرپێ و رایکرد! بە کۆڵانەکەدا هەڵدەهات و پاسەوانەکانیش بە شوێنیەوە بوون!

دیمەنی راکردنی پیرەژنەکە ئازاری دەدام! لە جیاتی ئەو، من عەزابم دەکێشا و لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

ـ ئێستا دڵی لە لێدان دەکەوێ! ئێستا دەمرێ!

پاسەوانەکان لە بەر دەرگای ماڵەکەی خۆیان گەیاندیّ! منداڵەکەیان لیّ ستاند و کەلەپچەیان کردا پیرەژنەکە بە غرورەوە دەیگوت:

ـ پەژیوانم، بەڵام ناچار بووم ئەو کارە بکەم! نامهەویّ منداڵەکەم لە ناو بەرم، بەڵام ناتوانم خەرجیی ئەو هەموو منداڵە دابین بکەم! ناتوانم!

هەر لەو کاتەدا بوو کە بە هۆی ژانەسکەوە لە خەو هەستام!

ئیتر نابیّ هاورێکەم ببینم! قسە هەڵیت و پڵیتەکانی دەبێتە هۆی ئەوەیکە خەونی ناخۆش ببینم! دوێنیّ بۆ خواردنی نانی ئێواریّ منی دەعوت کردبوو و چونکە هاوسەرەکەشی لە ماڵەوە نەبوو، سەبارەت بە تۆ زۆری قسە لە گەڵدا کردم! موسیبەتێک بوو! دەتگوت دوکتۆرێک بە ناوی "ئێچ بی مۆنسۆن" هاورایەتی!

ئەو لە سەر ئەو باوەریە کە جنین شتێکی بیّ گیانە! وەکو تۆوی گوڵێک کە دەکریّ بە کەوچکێک دەری بێنی! ئەو دوکتۆرە بە جنین دەڵیّ: نیزامی رێک و پێکی پێداویستییە وەدەی نەهاتوەکان! بەڵام بە رای زۆریەک لە دوکتۆرەکان ژیانی هەر کەسێک لە کاتی تێکەڵبوونی تۆوی نێر و مێیەوە دەست پێدەکات! چونکە هێلکۆکە دوای جوتبوونی، DNAی تێدایە! یانی هەر ئەو ئەسیدزوکسی ریبونوکلئیک کە بنەمای تەواوی ئەو پرۆتئینانەیە کە مرۆڤ پێک دێنن!

بەڵام دوکتۆر مۆنسۆن دەڵیّ: ئێسپێرماتۆزۆئید و هێلکۆکەش لە ناو خۆیاندا DNAیان تێدایە! ئەو کات دەبیّ ئێسپێرماتۆزۆئید و هێلکۆکەکانیش بە

زیندەوەر ناو بەرین! ژمارەیەک لە دوکتۆرەکان لە سەر ئەو باوەڕەن تۆو دوای بیست و چوار حەوتوو دەبێتە مرۆڤ، یانی هەر لەو کاتەوەی کە دەکرێ لە منداڵدان دەری بێنی و بە دامودەزگای پزشکی نەهێڵی بمرێت! هاوڕێکەم دەیگوت، کۆرپە مرۆڤ نییە چونکە هێشتا کاریگەری فەرهەنگ و کۆمەڵی بە سەرەوە نییە! تووشی شەڕ بووین! ئەو هاوڕای قسەکانی دوکتۆر مۆنسۆن بوو و منیش قسەکانی ئەوانی دیکەم بە دروست دەزانی! تووڕە بوو و منی بە لایەنگری لە قسەی قەشەکان تاوانبار کرد و هاواری کرد:

ـ تۆ کاسۆلیکی! تۆ کاسۆلیکی! کاسۆلیک!

پێم ناخۆش بوو! ئەو بە باشی دەیزانی کە من کەسێکی کاسۆلیک نیم و نەیاری قسەی قەشەکانیشم لەمبارەیەوە! من قەناعەت بە قسەکانی مۆنسۆن ناهێنم! هیچکات ناتوانم ئەوە قەبوڵ بکەم کە مرۆڤ سۆندێک دەخۆی رۆبکات وەکو ئەوەی خۆراکییەکی قورسی خواردبێت و بیهەوێ دایبنێ! قەناعەت ناکەم مەگەر ئەوەیکە ...

مەگەر ئەوەیکە چی؟ رەنگە خەریکی خەیانەت لە بڕیارەکەم بم! پێموابوو بە تەواوی لە بڕیارەکەم دڵنیام و هەموو کەڵکەڵە و دڵەڕاوکێکانم وەلاناون! ئەی بۆچی سەرلە نوێ بە سەدان بیانوو سەریان هەڵداوەتەوە؟ لە بەر ئەوەیکە خەم و خەفەتەکان تووشی سەرئێشەم دەکەن؟ بۆ ئەو خەم و خەفەتانەی کە لە سەر دڵم کۆبوونەوە؟

دەبێ خۆڕاگر بم! بچکۆلەکە! دەبێ متمانەم بە خۆم هەبێ و تۆ رابگرم! دەبێ تۆ لە ناو خۆمدا رابگرم هەتا لەدایک بی و گەورە ببی! دەزانم کە تۆ نە

وەکو ئەو قەشەیەت لێدێ کە لە خەوندا هاواری دەکرد، نەک وەکو دۆستەکەم بەو دوکتۆرە نەگبەتەوە، نەک وەکو ئەو پاسەوانانەی کە لە خەونمدا پیرەژنەکەیان کەلەپچە کرد! یەکێک تۆ بە هی ئاسمان دەزانێ! یەکێک تۆ بە کۆیلەی دایکت ناو دەبات و پاسەوانەکانیش پێیانوایە لە داراییەکانی دەوڵەتی! تۆ هی هیچکەس نی! تەنیا هی خۆتی! تۆ خۆت بڕیارت داوە و من بە هەڵەدا چووبووم کە پێموابوو بە زۆری دەمهەوێ بتهێنمە سەر ئەم دونیایە! من بۆ راگرتنت خەریکم هەر لەو شتە پەیڕەوی دەکەم کە بروسکەی بوونی تۆ، پیشانیدام! من بڕیارەکەم جێبەجێ کرد نەک ئەوەیکە بۆ خۆم موختار بم لە هەڵبژاردنیدا! لە نێوان من و تۆدا رەنگە ئەو کەسەی کە دەبێتە قوربانیی، من بم، نەک تۆ! کاتێک کە وەکو شەمشەمە کوێرەیەک خۆت بە جەستەمەوە دەنوسێنی، مەبەستت هەر ئەوە نییە؟ مەگەر ئەو کاتانەی کە خەریکی کارێکی و لەوانەیە منیش دڵم تێکەڵ بێت، مەبەستت هەر ئەوە نییە؟

حاڵم باش نییە! ئێستا ئەوە ماوەی حەوتوویەکە کە بە کارکردن هیلاک دەبم! یەکێک لە قاچەکانم ئیلتیهابی کردوە! زۆر ناخۆشە ناتوانم بچمە سەفەر! بەرپرسەکەم هەستی بەوە کردوە! ئەمڕۆ بە شێوەیەکی هەڕەشە ئامێزەوە لێی پرسیم دەتوانم بچمە سەفەر یان نا؟ دواتریش گوتی کە دەبێ بچی! ئەم سەفەرە شتێکی گرینگی تێدایە کە زۆر بە دەرد دەخوات! بەرپرسەکەم پێی خۆشە! منیش هەروا! ئەی ئەگەر نەتوانم بچم؟ بە دڵنیاییەوە دەتوانم! مەگەر دوکتۆر نەیگوت دووگیانی نەخۆشی نییە و شتێکی سروشتییە؟ مەگەر نەیگوت دەتوانم هەر درێژە بە کارەکانی پێشووترم بدەم؟ تۆ خیانەتم پێناکەی!

***

شتێکم بۆ هاتە پێشەوە کە هەر بە بیریشمدا نەدەهات! دوکتۆر منی خەواند و وکو نەخۆشێک کەوتمە نێو جێگا! دەبێ راکشێم و جوڵە نەکەم! کارێکی سانا نییە! دەزانی؟ چونکە بە تەنیا دەژیم و ئەگەر کەسێک زەنگی دەرگاکە لێبدات دەبێ هەستم و دەرگاکە بکەمەوە! تازە دەبێ خواردنیش ئامادە بکەم! دەبێ خۆشم بشۆرم! بۆ چێشت لێنان و خۆ شۆردن دەبێ لە جێگا بێمە دەرێ! وانییە؟ جارێ هاوڕێکەم گرفتی چێشتەکەی چارەسەر کردوە! کلیلی ماڵەکەم داوەتێ! ئەو فەقیرە رۆژێ دووجار خواردنم بۆ دێنێ! پێی دەڵێم:

ـ تۆ بە منداڵی سێهەمت رازیی نەبووی بەڵام ئێستا ناچاری ئاگاداریی لە مرۆڤێکی گەورە بکەی!

ئەو گوتی کەسێکی گەورەی لە منداڵ پێ باشترە چوونکە ناچار نییە شیری بداتێ! ئەگەر بڵێم کە هاوڕێکەم کەسێکی باشە، باوەڕم پێدەکەی؟ بە راستی کەسێکی باشە! نەک لە بەر ئەوەیکە سەردانم دەکات! بەڵکو لە بەر ئەوەیکە ئیتر باسی مۆنسۆن و دوکتۆرەکانی دیکە ناکات! دەڵێی لەوە ترساوە کە رەنگە تۆ لە دەست بدەم! نیگەران مەبە! هیچ مەترسییەک نییە! دوکتۆر چەند رۆژ لەمەوبەر پشکنینی بۆ کردم و گوتی خەریکە زۆر باش گەورە دەبێ! تەنیا گوتی بۆ دڵنیایی چەند رۆژێک لە سەر جێگا هەڵنەستم بۆ ئەوەی ئێش و ئازاری سکم زووتر باش ببێتەوە! تۆ ئێستاکە دوو مانگی و کۆرپەش لە دوو مانگیدا زۆر هەستیارە! هەر لەو کاتانەدایە کە تۆوەکە دەبێتە کۆرپەیەکی راستەقینە! یەکەمین خانەکانی ئێسقان دروست دەبن و

جێگای نەرماییەکان دەگرنەوە! قاچەکانت وەکو لقی دارەکان گەشە دەکەن و قامکەکانت وەکو چرۆ لە سەریان سەوز دەبن! هەتا سێ مانگی دەبێ ئاگامان لە خۆمان بێت و دواتر دەتوانین بچینەوە بۆ لای کارەکەمان! ئەم جموجۆڵ نەکردنە تەنیا پازدە ڕۆژ دەخایەنێت! بە درۆ خۆم نەخۆش کرد و بەرپرسەکەشم قەناعەتی کرد و گوتی دەتوانێ سەفەرەکەم پازدە ڕۆژ بخاتە دواوە! گوتی دەتوانێ هەتا ئەو کات خاوەخاو بە بەرنامەکان بکات! زۆر باش بوو! ئەگەر بە شتەکەی زانیبایە، کەسێکی دیکەی لە جیاتی من دەنارد! لەوانە بوو دەریشم بکات! ئەو کاتە ئێمە تووشی چەرمەسەرییەکی گەورە دەبووین! کێ خواردنی دەداینێ؟

ئیتر هیچ هەواڵێک لە باوکت نییە! ڕەنگە پێی خۆش نەبێ خۆی تێکەڵاوی گیروگرفتەکانی من بکات ... چییە پێت ناخۆش بوو؟ باوەڕ بکە هەر ئەو تۆزە هەستەش کە بەرامبەر بەو بووم دوای ئەم یەک دوو تەلەفۆنەی دوایی، کۆتایی پێهات! چونکە لە جیاتی ئەوەیکە خۆیم پیشانبدات و چاو لە چاوم ببڕێت، بە تەلەفۆن قسەی لە گەڵ کردم! لانیکەم دوای گەڕانەوە دەیتوانی خۆیم پیشانبدات! تۆ ئاوا بیر ناکەیتەوە؟ ئەو باش دەزانێ کە داوای لێناکەم ژیانی هاوسەریم لەگەڵ پێک بێنێت! هیچکاتێک ئەم داوایەم لێی نەبوە! هیچکاتێک ئارەزووی هاوسەرگیریم نەکرد و ناشیکەم! ئەی بۆچی خۆی شاردۆتەوە؟ لەوانەیە لە بەر ئەوە بێ کە چونکە تەنیا لە کاتی خەوتندا منی خۆش ویستوە، هەست بە گوناه دەکات!

ڕۆژێکیان پیرەژنێک چوو بۆ لای قەشەیەک بۆ ئەوەی کە لە ناخی دڵەوە دان بەو کارانەدا بنێ کە کردبوونی، بەڵام قەشەکە پێی گوت:

ـ له گەڵ هاوسەرەکەت مەخەوە!

بـە رای زۆر کـەس گونـاهی راسـتەقینەی ژن و پیـاو ئەوەیـە کـە پێکـەوە دەخـەون! ئـەوان دەڵـێن بـۆ ئـەوەی گوناه نەکـەین، هـەر ئەوەنـدە بەسـە کـە منـداڵمان نـەبێت! بـەڵام لـەو رووەوە دەکرێـت تێبگـەی کـێ تاوانبـارە و کـێ بێتاوانە، کەواتـە وەرن هـەمووومان هـیچ خەتایـەک نەکـەین هـەتا پیـر دەبین! ئـەو کـات هـەموو مرۆڤـەکانی جیهـان دەبنـە پیـرەپیـاو و پیـرەژن کـە لـە منداڵبوون عاجزن! وردەوردە مرۆڤایەتی بەرەو نابودی دەچێت و رێک هەر وەکـو چیرۆکـە زانسـتی و خەیاڵاویـەکان کـە لـە گـۆی مـەریخ روو دەدەن، شارەکان پڕ دەبن لەو بینا دارِوخاوانـەی کە تـەنیا روحـەکان تێیانـدا دەژیـن! روحی ئەو کەسانەی کە دەیانتوانی بژین، بـەڵام نەیانویسـت! روحـی تـەواوی ئـەو کۆرپانـەی کـە هیچکـات چاویـان بـە ژیـن نەپشـکوت! کەوتنـە شـوێن هاورِەگـەزەکانیش هـەر ئـەو ئاکامـەی هەیـە: هەسـارەیەک کـە پـڕە لـەو کەسانەی کە لە منـداڵبوون عـاجزن و ئەو شارە کاولانـەی کـە تـەنیا روحـی منداڵانی لە دایک نەبوو تێیاندا نیشتەجێن!

رەنگـە بکـرێ لـەو مرۆڤـە بـە سـاڵاچوانە کـەڵک وەربگـری! لـە شـوێنێکدا خۆیندمـەوە کـە دەکـرێ جنـین لـە سـکی کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی تـر بگوازرێتـەوە! بـە شـێوازی بایۆلۆژیـا و تێکنۆلۆژیـا! ئـەو هێلکۆکەیـەی کـە پرۆسـەی جـووت بـوونی بـە ئـەنجام گەیانـدوە لـە سکی دایک دەریـدێنن و دەیخەنە سکی ژنێکی دیکەوە کە ئامادەگی هەبێ و لێی دەگەڕێن لە لای دایکی تازەی گەشە بکات! ئەگەر کەسێکی تر ئامادە بوایە تۆ قەبوڵ بکات ـ بۆ وێنە پیرەژنێک کە حـەزی لـە خـەوتن لـە جێدایـە ــ تۆ زۆر بـە هاسانی

چاوت بە ژین دەپشکوت و منیش هێندەم خەفەت لێ نەدەخواردی! منداڵ بەرهەم هێنان هەر کاری کەسانی بەساڵاچووە! ئەوان تاقەتی باشیان هەیە بۆ ئەو کارە! رەنگە بێحورمەتی بێ ئەگەر بێجگە لە من بتخەنە سکی ژنێکی تریشەوە! چوونە ناو سکێک کە تاڵی و سوێری رۆژگاری چەشتوە و هیچکات بۆڵەبۆڵت بە سەردا ناکات، بۆ دەبێ نارەحەتت بکات؟ خۆ ژیانت لێ ناستێننەوە! تەنیا ماڵێکی دیکەت پێدەبەخشن ...

بمبورە! قسەی هەڵیت و پڵیت دەکەم!

گرفتەکە ئەوەیە کە ئەم جموجۆڵ نەکردنە تورە و مرچ و مۆنم دەکات!

***

ئەمرۆ روداوێکی خۆشم بۆ هاتە پێشەوە! زەنگیان لێدا و بە بۆڵە بۆڵ لە جێگاکەم هاتمە دەرێ! کارمەندی پۆست (بەریدە)کە پاکەتێکی هێنا! پاکەتێک لە لایەن دایکمەوە کە نامەیەکی خۆی و باوکیشمی لە گەڵ بوو! چەند رۆژ لەمەوبەر لە بوونی تۆ ئاگادارم کردبوونەوە! هەستم بەوە دەکرد کە ئەوانیش مافی خۆیانە بیزانن! هەموو بەیانییەک چاوەرێی بیستنی وەڵامی ئەوان بووم و کە بیریشم لەو قسە ناشیرینانە دەکردەوە کە قەرار بوو ئاراستەمی بکەن، هەڵدەلەرزیم! ئاخر دەزانی، ئەوان مرۆڤی نەوەی رابردوون! بەڵام نامەکەیان تێیگەیاندم کە سەرەرای ئەوەیکە لەم هەواڵە سەریان سوور مابوو، بە بوونی تۆ خۆشحاڵن و بەمجۆرە پیرۆزبایی خۆیان ناردبو:

ئێمە ئیتر دوو درەختی وشک هەڵاتووین و هیچمان نییە کە فێری تۆی بکەین! ئێستا ئەوە تۆی کە دەتوانی هێندێک شت فێری ئێمە بکەی! ئەگەر ئاوا بڕیارێکت داوە، بێگومان بڕیاری بە جێ هەر ئەوەیە! ئێمە بۆیە نامەمان بۆ تۆ نووسی بۆ ئەوەی بزانی کە وانەکانی تۆمان لا پەسندە!

دوای خوێندنەوەی نامەکە پاکەتەکم هەڵپچڕی! سندووقێکی چکۆڵەی پلاستیکی تێدا بوو کە جوتێک پێڵاوی چکۆڵەی سپی و سووکی تێدا بوو! یەکەمین پێڵاوەکانی تۆ! لە سەر بەرە دەستم جێگایان دەبێتەوە و تازە لە دەستیشم چکۆلەترن! کاتێک بە دەستیانەوە دەگرم، کۆڵەگری لە گەرووم دەمێنێ و دڵیشم لە لێدان دەکەوێت! بە دڵنیاییەوە دایکمت خۆش دەوێت! بە دایکمەوە تۆ دوو دایکت هەیە و ئەوەش نیعمەتێکی گەورەیە! ئەوت خۆش دەوێت، چونکە پێیوایە کە بە بێ منداڵان، جیهان کۆتایی پێدێت! ئەوت خۆش دەوێت چونکە خەپە و میهرەبانە و گەدەیەکی نەرمی هەیە کە دەتوانی لە سەری دابنیشی و بە دەستە قەڵەوەکانی دەتوانێ تۆ هەڵبگرێ! دەنگی بە هەزاران زەنگوولە لە پێکەنینەکانیدایە! هیچکات نەمزانی چۆن ئاوا پێدەکەنێت! بەڵام پێموابێ هۆکارەکەی ئەوە بێت کە زۆر دەگریت! تەنیا ئەو کەسانەی کە زۆر دەگرین دەتوانن قەدری جوانیەکانی ژیان بزانن و بە باشی پێبکەنن! گریان هاسانە و پێکەنین دژوار! زۆر زوو ئەوەت بۆ دەردەکەوێت! کاتێک چاوت بە ژین دەپشکوێ بە کوڵ دەگری و دواتریش هەتا ماوەیەک بێجگە لە گریان هیچت لە دەست نایەت! هەموو شتێک دەتگریەنێت: شۆق، برسێتی، پەشێوی! چەند حەوتوو و چەند مانگ دەخایەنێت هەتا بزە بێتە سەر لێوانت و گەرووت بە پێکەنین بلەرێتەوە!

بەڵام نابێ بەو قسانە بێ هیوا بی! کاتێک بزەت هاتێ، کاتێک پێکەنی، دەبێ پێکەنینەکانت پێشکەشی من بکەی هەتا بەمشێوەیە هەست بەوە بکەم کە کارێکی باشم کرد رووم لە بایۆلۆژیا ـ تێکنۆلۆژیا نەکرد و سکی دایکێکی ترم بە نسیبی تۆ نەکرد!

***

ئەو وێنەیەی کە لە دوو مانگیدا تۆم پیشان دەدات، لە رۆژنامەکەم کردەوە! وێنەی دەمووچاوت کە چل جار گەورە کراوەتەوە! ئەوم لە دیوارەکە داوە و لە سەر قەرەوێڵەکەمەوە لێی دەڕوانم! ئەفسوونی چاوەکانت بووم! لە قەدەر جەستەت چەندە گەورەن و چۆنیش هەڵتهێناون! بە راستی ئەوان چی دەبینن؟ تەنیا ئاو؟ لە گەڵ دیوارەکانی زیندانەکەت؟ لەوانەیە هەر ئەو شتانەی کە من دەیانبینم! گومانم هەیە لەوەیکە تۆ لە ناو مندا دەرێ ببینی! خەفەت دەخۆم بە زانینی ئەوەیکە چەند رۆژی تر دەبێ چاوەکانت لێک بنێی! ماددەیەکی وەکو هەویر سەر پێڵوەکانتی داپۆشیوە کە هەتا چەند رۆژێکی تر پێکیانەوە دەنوسێنێ! بۆ ئەوەی هەتا کاتێک کە پێڵوەکانت کامڵ دەبن، چاوەکانت هیچیان لێ نەیەت! هەتا حەوت مانگی چاو هەڵناهێنی! بیست حەوتوو لە تاریکاییەکی چاونەبین دای! حەیف! لەوانەیە واش نەبێ! کاتێک هیچ شتێکت بۆ لێ ڕوانین نەبێت! باشتر گوێ بۆ قسەکانم رادەگری! هێشتا زۆر شت ماوە کە پێتی بڵێم و ئەم رۆژانە کە بە تەواوی ئیسراحەت دەکەی دەرفەتێکی باشە چونکە لەم رۆژانەدا بێجگە لە خوێندنەوەی کتێب و لە تەلەفزیۆن روانین، هیچ کارێکی دیکەم نییە! تازە دەبێ تۆ بۆ بەرەوڕوو بوونەوە لە گەڵ دنیایەک راستیی تاڵ ئامادە بکەم! هیوا بەوەیکە تۆ هەر

ئێستا هەموو شتێک دەزانی، منی پێ بە قەناعەت ناگات! بەڵام دەربڕینی هەموو شتێکیش ئاسان نییە! چونکە ئەگەر روحێکت هەبێ، باوەڕت بە هێندێک شتە کە لەگەڵ ئەو شتانەی کە لە جیهاندا دەیانبینی، جیاوازیی زۆرە! تۆ تەنیای! تەنیایەکی شکۆدار! تەنیا ئەزموونت هەر بۆ خۆتی! بەڵام هی ئێمە لە ئەژمار نایەن! بە هەزاران هەزار مرۆڤین! ئەزموونی هەرکامێکمان پەیوەندیی بەوانی دیکەوە هەیە! شایی و ئازارەکانیشمان هەروا ...

باشە لێرەوە دەست پێدەکەم! رایدەگەیەنم کە لە جیهاندا بە تەنیا نی و ئەگەر بتهەوێ تاک تەنیا بی، سەرکەوتوو نابی! لەم جیهانەدا هیچکەس ناتوانێ وەکو تۆ تەنیا بێت و بۆ خۆی پێداویستیەکانی چارەسەر بکات! ئەگەر وابکات شێت دەبێت! یان لە باشترین حاڵەتدا شکست دەخوات! هێندێک جار کەسانێک هەن کە ئەم کارە تاقی دەکەنەوە! دەچنە نێو دارستانەوە یان دەچنە لای دەریاکان و سوێند دەخۆن کە پێویستییان بە کەس نییە و هیچکەسیش ناتوانێ بیاندۆزێتەوە! بەڵام دەیاندۆزنەوە! تەنانەت هێندێک جار بۆ خۆیان دەگەڕێنەوە! بە هیوابڕاوی دەگەڕێنەوە سەر جێگاکەی هەوەڵیان و نێو هیلانە مێروولە و بەرداشەکانی رۆژگار هەتا بە شوێن ئازادییدا بگەڕێن! دواتر سەبارەت بە ئازادی شتی زۆر دەبیستی! ئێمە لێرە وشەیەکمان هەیە کە زۆر زیاتر لە وشەی عەشق نێوی زڕاوە! پیاوی وادەبینی کە بۆ ئازادی هەڵاهەڵابوون و ئەشکەنجە و تەنانەت مەرگیشیان بە گیان و بە دڵ قەبووڵ کردوە! هیوادارم تۆ یەکێک لەوان بی! سەرەڕای هەمووی ئەوانەش کاتێک لە پێناو ئازادیدا کوت و لەتت دەکەن، تێدەگەی کە هەر بوونی نییە! لانیکەم بەو چەشنەی کە تۆ دەتهەوێت، بوونی نییە!

وەکو بیرکردنەوەیەک، وەکو خەیاڵێک کە لە ویژدانی بەر لە لەدایک بوونتەوە سەرچاوەی گرتوە! لەو کاتەدا کە ئازاد بووی چونکە بە تەنیا بووی، لە نێو سکی مندا یەخسیر کرای! جێگاکەت تەنگ و تاریکە و هەتا بیست حەوتووی دیکەش دەبێ هەر لەوێ بمێنیتەوە! بەڵام لەو جێگا تەنگەدا، لەو تاریکییەدا، بە رادەیەک ئازادی کە هیچکات لەم جیهانە بێبەزەییەدا وەها ئازادییەک نابینیەوە! نە دەبێ داوای یارمەتی لە کەس بکەی، نە داوای لێبوردن بکەی، چونکە نە هیچکەسێک لە لاتە و نە لە یەخسیربوونی کەسانی دیکەش ئاگاداری! کاتێک هاتیە دەرێ! بە هەزاران خاوەنت بە سەر سەرەوەیە! یەکەمین خاوەنت منم چونکە بە بێ ئەوەی بمهەوێ و بزانم، ئەو شتانەت بە سەردا دادەسەپێنم کە بە رای خۆم باشن، نەک بە رای تۆ! بۆ نمونە هەر ئەو پێڵاوە بچکۆلانە! بە رای من جوانن بەڵام رای تۆ دەبێ چی بێت؟ کاتێک ئەوانت لە پێکەم تۆ دەگری و خۆت تێک دەنێی! دڵنیام کە پێڵاوەکان تێکت دەدەن! بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە پێت دەکەم و بە خەیاڵی خۆم بۆیە ئەو کارە دەکەم بۆ ئەوەی سەرمات نەبێ! تۆش وردە وردە لە گەڵیان رادێی! رام دەبی! هێندە لە گەڵیان رادێی کە بە بێ ئەوان تووشی ئازار دەبی! ئەوە سەرەتای هەموو ئەو کۆت و بەندانەیە کە هەمیشە ئاڵقەی یەکەمی لە لای منە، چونکە تۆ پێویستت بە منە! من دەبێ خۆراکت بدەمێ، دەبێ بتشۆرم، دەبێ لە باوەشت بکەم و بتبەم بۆ گەڕان! دواتر خۆت پێ هەڵدەگری، بۆ خۆت شت دەخۆی، خۆت بڕیار دەدەی کە کەنگێ و لە کوێ بۆ گەڕان بچیتە دەرێ و کێ دەمووچاوت بۆ بشوات! ئەو کات کۆت و بەندی نوێ دێنە سەر ڕێگات: قسەکان و نەسیحەتەکانم! تۆ دەترسی لەوەیکە کارێکی پێچەوانەی ئەو شتانە بکەی کە من پێم گوتووی، نەکا لێت

برِەنجێم! کاتی زۆری دەوێ هەتا لێت بگەڕێم بە کەیفی خۆت هەرچیت پێ خۆش بوو بیکەی! ڕێک هەر وەکو ئەو بێچوە چوێلەکانەی کە کاتێک فێری هەڵفڕین دەبن، دایک و باوکیان ئەوان لە هێلانەکەیان وەدەر دەنێن! ئاخرەکەی ڕۆژێک دێ کە لێت گەڕێم بڕۆی! لێت گەڕێم تەنیا بی و لە کاتێکدا کە چرای سەر شەقامەکە سوورە، بەوێدا تێپەڕی! تازە هانیشت دەدەم! بەڵام ئەو کارە هیچ شتێک بە ئازادیتەوە زیاد ناکات، چونکە هێشتا زیندانیی خۆشەویستیەکانی منی و میهرەبانیەکانم تۆیان لە خۆیاندا زیندانی کردوە. هەر ئەو شتانەی کە بنەمای بنەماڵەیی پێدەڵێن! من باوەڕم بە بنەماڵە نییە! بنەماڵە درۆیەکی گەورەیە! ئەوانەی کە ئەم جیهانەیان بە شێوەیەک ڕەخساندوە کە بتوانن کەڵک لە خەڵکەکەی وەرگرن و بە سەریاندا زاڵ بن ئەم درۆیەیان لە سەریەک ناوە! مرۆڤی تەنیا زووتر رادەسێ و کاتێک لە گەڵ کەسانی دیکەیە، خۆی بە دەستی چارەنوس دەسپێرێ! بنەماڵە وەکو شوێنێکی نیزامی (سەربازی) وایە کە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا قەتیست دەکات! بنەماڵە هەر شتێکی شەریف نییە! تەنیا شتێک کە هەیە ئەوەیە کە چەند ژن و پیاون و بڕیارە هاوناو بن و لە شوێنێک پێکەوە بژین! زۆربەشیان یەکتریان خۆش ناوێ! سەرەڕای ئەوەش هێندێک هۆگریی پێکدێت و وەکو ئەو درەختانەی کە لە بەرامبەر تۆفاندا ڕادەوەستن، لە ناخماندا رەگ دادەکوتن! ناکرێ وەکو برسێتی و تینوێتی لە گەڵیان بەرەوڕوو ببیتەوە! تەنانەت بە ویست و عەقڵیش ناکرێ لە چنگانیان دەرباز بیت! مرۆڤ هەستدەکات لە بیری کردوون بەڵام لە پڕرا دەبینی سەرلەنوێ زیندوو بوونەوە و بێبەزەییانەتر لە هەرچی جەللادە تەنافێکیان لە ملی ئالاندوە و پشوویان لێ بڕیوە! بێجگە لەو کۆیلەتیانە، کۆت

و بەندی تریش هەن کە دەبێ لە بەرامبەریاندا راوەستی! ئەو کۆت و بەندانەی کە لە لایەن بە هەزاران هەزار مێرووڵەی ئەو هێلانە گەورەیەوە تووشت دەکرێن! شتەباوەکان و یاساکانیان! هەر ناتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە کە سەردانەواندن بۆ ئەو داب و نەریت و یاسایانەی کە کەسانی دیکە پێکیان هێناون، چەندە ناخۆشە! ئەم کارە مەکە، ئەو کارە بکە! ئاوا بە، ئاوا مەبە! ... ئەو قسانە ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا بکرێن کە مرۆڤەکانی لە مانای ئازادیی ژیان تێدەگەن، تەحەمول دەکرێ، بەڵام هەیهات لەوەیکە لە ژێر دەسەڵاتداریێتی دیکتاتۆرێکدا بی، چونکە تەنانەت لە تام و چێژی بیر کردنەوە لە ئازادیش بێبەریت دەکات! ئەو کات ژیان دەبێتە جەهەننەم! یاسا زاڵمانەکان تایبەتمەندییەکیان هەیە ئەویش ئەوەیە کە تەنیا بە خەبات و لە خۆ بوردوویی دەکرێ لە گەڵیان تێکەوی! بەڵام یاساکانی کۆمەڵگایەک کە مرۆڤی میهرەبان تێیدا دەژین، هیچ رێگەی دەربازبوونت بۆ ناهێڵێتەوە، چوونکە بە خۆتی دەسەلمێنی کە قەبوڵکردنیان کارێکی بەجێیە! لە هەر کۆمەڵگایەکدا بژی، ناتوانی لە گەڵ ئەو بنەمایە بجەنگی کە هەرکەس بەهێزتر و دڵڕەشترە، هەمیشە براوەیە! ناتوانی لە گەڵ یاسایەک بجەنگی کە دەڵێ دەبێ بۆ خواردنی خۆراک پارە خەرج بکەی، بۆ خەوتن دەبێ پارە بدەی، بۆ خۆ گەرم کردنەوەی زستان دەبێ پارە بدەی و بۆ هەبوونی پارەش دەبێ کار بکەی! سەبارەت بەوەیکە کار کردن شتێکی پێویست و پیرۆزە و مرۆڤ دەگەشێنێتەوە، کۆڵێک قسەت بۆ لە سەر یەک دەنێن! هیچکات باوەڕیان پێ مەکە! ئەوانە هەر پیلانی ئەو ئەربابانەن کە جیهان ئیدارە دەکەن! کار، کۆیلەتییە! تەنانەت کاتێک کە بە حەزیشەوە بیکەی هەر کۆیلەتییە! هەمیشە بۆ کەسی دیکە کار دەکەی و بۆ خۆشت هیچ! هەمیشە

بە هیلاکیەوە کار دەکەی نەک بە گەشاوەییەوە! کاتێک دەتهەوێ کار بکەی، کار نییە! تەنانەت ئەگەر سەر بە کەسێک یان شوێنێک نەبی، ناچاری زەویەکەشت کاتێک بکێڵی کە هەتاو و بارانیش لە لایەن ورزەکانی ساڵەوە دیاری دەکرێ! تەنانەت ئەگەر گوێڕایەڵی کەس نەبی، تەنانەت ئەگەر کارەکەشت هونەر ـ کە ناخی ئازاددییە ـ بێت، دیسانەوە هیچ ڕێگە چارەیەکت بێجگە لە قەبوڵکردنی وردە فەرمایشەکان و بێحورمەتییەکانی ئەم و ئەو نییە! ڕەنگە لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا ئاوا نەبوبێ و کارکردنیش بۆ خۆی خۆشییەکی تێدا بوە! بەڵام ئەو کاتە مرۆڤەکان کەمتر بوون و دەکرا لێیان دوور بکەویەوە! تۆ هەزار و نۆسەد و حەفتا و پێنج ساڵ دوای پیاوێک لە دایک دەبی کە ناوی مەسیح بوو! مەسیحیش ئەو پیاوەیە کە ئەویش بۆ خۆی بە هەزاران ساڵ دوای پیاوێک لە دایک بووە کە هیچکەس ناوی نازانێت! لەم سەردەمەی ئێمەدا هەلومەرجەکە هەر بەو چەشنەیە کە باسم کرد! ئامارێکی نوێ دەڵێ ژمارەمان گەیشتۆتە چوار میلیارد کەس! بچکۆلەکە! تۆ پێ دەنێیتە نێو ئەو چوار میلیارد کەسەوە! دواتریش زۆر خەفەت بۆ ئەو تەنیاییەی ئێستات دەخۆی!

***

سێ چیرۆکم بۆ نوسیوی! یانی لە ڕاستیدا نەمنوسیون چونکە ئاوا بە ڕاکشانەوە ناکرێ هیچ بنوسی! باشتر وایە بڵێم لە زەینی خۆمدا ئەو چیرۆکانەم بۆ لە سەر یەک ناوی! یەکێکیانت بۆ دەگێڕمەوە!

رۆژێک بوو، رۆژێک نەبوو، کچۆڵەیەکی چکۆلە عاشقی داری ماگنۆلیا بوو! (Magnolia ناوی دارێکی هەمیشە سەوزە کە گوڵی جوان و بۆن خۆش دەردەکات.)

ماگنۆلیایەکیان لە ناوەڕاستی باخەکە ناشتبوو و کچۆڵەکەش بە درێژایی رۆژ تێی رادەما! لە سەرەوەڕا لە دارەکەی دەڕوانی چونکە لە دوایین نهۆمی بینایەکدا دەژیا کە لە تەنیشت ئەو باخە بوو! لە پەنجەرەیەکەوە لەو دارەی دەڕوانی کە تەنیا هەر ئەو پەنجەرەیە رووی لە باخەکە بوو! کچۆڵەکە زۆر چکۆلە بوو و بۆ ئەوەی بتوانێ سەیری ماگنۆلیاکە بکات ناچار بوو بچێتە سەر کورسییەک و کاتێک دایکی ئاوا چاوی پێی دەکەوت هاواری دەکرد:

ـ ئەی هاوار! ئێستا بەر دەبێتەوە! ئێستا بەر دەبێتەوە ...

ماگنۆلیاکە گەورە بوو و لق و پۆپی گەورەی داهێشتبوو! گوڵە گەورەکانی وەکو دەسماڵی خاوێن بە حەواوە پشکوتبوون و کەسیش دەستی نەدەگەیشتنێ هەتا لێیان بکاتەوە! هەر بۆیە پیر و زەرد دەبوون و هەڵدەوەرین! بەڵام کچەکە بەردەوام لەو خەیاڵەدا بوو کە کەسێک هەر دەبێ بتوانێت یەکێک لەو گوڵانە کە هێشتا سپییە و هەڵنەوەریوە، لێ بکاتەوە! هەر بەو خەیاڵەوە بە درێژایی رۆژ لە بەر پەنجەرەکە هەڵنەدەستا! دەستی دەخستنە سەر پەنجەرەکە و سەریشی وێ دەکردن! هیچ ماڵێکی دیکە رووبەڕووی باخەکە یان لە دەوروبەری باخەکە نەبوو! تەنیا دیوارێکی بەرز بە دەوری باخەکەدا کێشرابوو کە هەیوانێکیش لەو سەریەوە دیار بوو! لە سەر تەلەکانی هەیوانەکە هەمیشە جلی شۆراوی لە سەر بوو! کاتێک جلەکان وشک دەبوونەوە و بە دەم باکەوە دەجوولانەوە، ژنێک بە

زەمبیلەیەکـەوە دەهـات و کـۆی دەکردنـەوە و دەیبردنـەوە ژووریٚ! بـەڵام ڕۆژێکیان ئەو ژنە هاتە دەریٚ و لە جیاتی لە جلەکانی بڕوانیٚ لـە ماگنۆلیاکە ڕاما! دەتگوت لـە بیـری لێکردنـەوەی یـەکێک لـەو گوڵانـە دایـە! بـۆ مـاوەی چەنـد دەقیقەیـەک لـەویٚ ڕاوەسـتا و خـەیاڵات هـەڵیگرت! جلـە وشـکەکان هەروا دەجووڵانەوە! هەر ڕێک لەو کاتەدا پیاوێک هات و ژنەکەی ماچ کرد! ئـەویش مـاچی کـردەوە و وردە وردە لـە سـەر زەویەکـە ڕاکشـان و دوای ماوەیەک جموجۆڵ بە جەستەی شەکەتەوە خەویان لێکەوت! کچۆڵەکە پێی سـەیر بـوو! نەیـدەزانی ئـەو دووانـە لـە جیـاتی بیـر لـە لێکردنـەوەی گـوڵێکی ماگنۆلیاکە بکەنەوە، بۆچی لە هەیوانەکە خـەویان لێکـەوتوە! هـەروا چاوەڕوان بوو هەتا پیاوێکی دیکە هات! ئەو پیاوە زۆر توڕە بوو! هیچی نەدەگوت بـەڵام دیار بوو کە زۆر توڕەیە! سـەرەتا پـەلاماری پیاوەکـەی دیکـەی دا بـەڵام ئـەو ڕایکـرد! دواتـر کەوتـە شـوێن ژنەکـە کـە هەوڵیـدەدا لـە لای جلەکانـەوە کەلێنێک بدۆزێتەوە و بچێتە ئەو دیوی هەیوانەکە! ژنەکەی گرت و بـەرزی کردەوە ــ بـە چەشنێک کە دەتگوت هـەر کێشی لە بـەر نییـە ــ دواتـر لـە هەیوانەکـەوە خسـتیە خـوارەوە و کەوتـە سـەر دارە ماگنۆلیاکـە! تـا ژنەکـە گەیشتە دارە ماگنۆلیاکە زۆری پێچـوو! کاتێـک کەوتـە سـەر دارە ماگنۆلیاکـە لقێکی شکا! هەر لەو کاتەدا کە لقەکە شکا، ژنەکە گوڵێکی لێکردەوە و دواتـر لە جوڵە کەوت! کچۆڵەکە بانگی دایکی کرد و گوتی:

ـ دایە! ژنێکیان بەردایەوە سەر ماگنۆلیاکە و ئەویش گوڵێکی لێکردەوە!

دایکی بە پەلە خۆی گەیاندیٚ و هاواری کرد:

ـ ئەو ژنە مردوە!

لەو رۆژە بەدواوە کچۆڵەکە تێگەیشت کە بۆ لێکردنەوەی هەر گوڵێک دەبێ ژنێک بمرێ!

ئەو کچۆڵەیە من بووم! خۆزگە رۆژێکی وا نەیەت کە تۆش وەک من هەست بەوە بکەی کە بە هێزترین و دڵڕەشترین هەمیشە براوەیە! خۆزگە وەکو من لە سەردەمی لاوێتیدا هەست بە شتی وا نەکەی! خۆزگە بزانی کە ژن یەکەمین کەسێکە کە تاوانی ئەم راستییە دەداتەوە! بەڵام لە خۆڕا شتێکی ئاوا بە ئاوات دەخوازم! دەبێ هیواداربم کە هەرچی خێراتر ئەو بەستەزمانییەی کە پێیدەڵێن سەردەمی منداڵی یان سەردەمی خەیاڵ پڵاو لێت دوور کەوێتەوە! دەبێ فێرت بکەم کە هەر لە منداڵییەوە لە هەموان بەهێزتر و خێراتر بی! دەبێ بتوانی داکۆکی لە خۆت بکەی و هەمیشە ئەوە کەسانی دیکە بن کە لە هەیوانەکە بەر دەبنەوە! بە تایبەتی ئەگەر ژن بی، دەبێ زۆرت بەهێز بکەم! ئەوەش یاسایەکە! لە هیچ شوێنێک نەنوسراوە بەڵام بە ناچار دەبێ پەیڕەو بکرێ: یان من، یان تۆ! یان من خۆم دەرباز دەکەم، یان تۆ خۆت دەرباز دەکەی! بنەمای یاساکە هەر ئەوەیە! ئاگات لە خۆت بێت لە بیرت نەچێتەوە!

لەم جیهانەدا هەموو کەس کەسێکی تر ئازار دەدات! بچکۆلەکە! ئەگەر تۆ ئەو کارە نەکەی نابوت دەبی! گوێ لە قسەی ئەو کەسانە رامەگرە کە دەڵێن هەمیشە کەسانی باش لە ناو دەچن! جاری وایە ئەوە لاوازەکانن کە لە ناو دەچن نەک باشترینەکان! من هیچکات نەمگوتوە کە ژنان لە پیاوان باشترن و دەبێ بە هۆی ئەو دڵە پاکەیانەوە بمرن! دڵی پاک و دڵی ناپاک هەر حیسابیشی بۆ ناکرێ! لەم جیهانەماندا ژیان هیچ پەیوەندیی بەم

شتانەوە نییە! تەنیا دەسەڵات و هێز و جینایەت جیهان ئیدارە دەکات! تەنیا بە توندوتیژییەوە زیندوو دەمێنیتەوە! رۆژێک پێڵاوی چەرمین لە پێ دەکەی چونکە کەسێک گایەکی سەربڕیوە و پێستەکەی لێکردۆتەوە بۆ ئەوەی لە چەرمەکەی کەڵک وەربگرێت! رۆژێک باڵتۆی پەشمین لە بەر دەکەی چونکە کەسێک ئاژەڵێک ـ یان لەوانەیە بە سەدان ئاژەڵ ـ ی کوشتوە بۆ ئەوەی بە پەشمەکەیان باڵتۆ دروست بکات! جەرگی مریشک دەخۆی، چونکە کەسێک پەلەوەرێکی سەربڕیوە کە دەرەقەتی مرۆڤ نایەت! تازە خودی ئەو مریشکانەش ئازاری بوونەوەری دیکە دەدەن! ئەوانیش ئەو کرمە چکۆلانەیان دەخوارد کە خەریکی خواردنی کاهو بوون! هەمیشە کەسێک هەیە کە ئەوی دیکە دەکوژێ یان کەوڵی دەکات بۆ ئەوەی بۆ خۆی زیندوو بمێنێتەوە! لە مرۆڤەوە بگرە هەتا دەگاتە ماسی! تەنانەت ماسییەکانیش یەکتری دەخۆن! گەورەکان، چکۆلەکان دەخۆن! هەروەها سەرجەم باڵندە و جڕ و جانەوەرەکانی دیکەش هەروان! ئەوەندەی من ئاگادار بم تەنیا درەختەکان بە کەسەوە نادەن و نایکوژن! لە ڕێگای ئاو و هەواو و خۆرەوە دابین دەبن! بەڵام جاری وا هەیە کە درەختە گەورەکان ناهێڵن خۆر بگاتە درەختە چکۆلەکان و وشکیان دەکەن! ئایا بە راستی پێویستە بۆ تۆ کە بە بێ کوشتار دەژی و خۆراک دەخۆی و خۆت گەرم دەکەیەوە، لە گەڵ وەها کوشت و کوشتارێک ئاشنا ببی؟

***

ئەوەش چیرۆکێکی دیکە:

رۆژێک بوو، رۆژێک نەبوو، کچۆڵەیەکی چکۆلە بوو کە زۆری حەز لە شوکلات بوو! بەڵام هەرچی زیاتر ئیشتیای دەچۆیە، کەمتر وەدەستی دەکەوت! دەزانی بۆ؟ چونکە پێشووتر رۆژێک لە رۆژان بە هەر رادەیەک کە ویستبووی دابویانیّ! ئاخر ئەو پێشووتر لە ماڵێکدا دەژیا کە لە سەرجەم پەنجەرەکانیەوە ئاسمان دیار بوو! بەڵام رۆژێکیان لە ماڵێکی بیّ ئاسمان و بیّ شوکلاتدا لە خەو هەستا! لە پەنجەرەکانیەوە کە بە میچەکەوە نووسابوون و وەکو پەنجەرەکانی زیندان دەچوون، تەنیا پێی ئەو کەسانەی دەبینی کە لە سەر شەقامەکە ئاموشۆیان دەکرد! سەگەکانیش دیاربوون و ئەوەش خۆی نیعمەتێک بوو، چونکە لانیکەم هەموو جەستەیان دەبیندرا! بەڵام سەگەکان لە ناکاو قاچێکیان بەرز دەکردەوە و بە پەنجەرەکەیان هەڵدەمیزت! ئەو کات دایکی کچۆڵەکە لە کاتێکدا کە بوغز گەرووی گرتبوو دەیگوت:

ـ نا! لەویّ نا! لەویّ نا!

دایکی هەمیشە دەگریا! بە تایبەت کاتێک کە لە گەڵ سکی ئاوساوی خۆی و کەسێک کە لەوێدابوو قسەی دەکرد:

ـ نەتدەتوانی کاتێکی گونجاوتر بۆ لە دایک بوونت بدۆزیتەوە؟

لەو کاتانەدا باوکی کچۆڵەکە کە لە ناو جێگاکەدا کەوتبوو، دەستی بە کۆخە کۆخ دەکرد! کۆخەیەکی قورس کە هەموو جاریّ نیوە گیان دەبوو! باوک بە دەموچاوێکی زەردهەڵگەڕاو و فرمێسکاوی و خەمین، بە درێژایی رۆژ هەر لە نێو جێدا دەمایەوە! هەتا ئەو جێیەی کە کچەکە دەیزانی شوکلاتەکان هەر رێک دوای نەخۆش کەوتنی باوکی و گواستنەوەی ماڵەکەیان بۆ ئەو ماڵە بیّ

خۆرەتاوە تەواو ببوون! یانی دوای ئەوەی پارەیان نەمابوو! بۆ دابینکردنی پارە، دایکی کچۆڵەکە ببوە خزمەتکاری ژنێکی دەوڵەمەند کە هاوتەمەنی خۆی بوو! ژنێکی زۆر دەوڵەمەند کە بەردەوام جلی جۆراوجۆر و پێڵاوی جۆراوجۆریشی لە بەر دەکرد! ماڵەکەیان لە سەر لێواری چەمەکە بوو و لە پەنجەرەکانیەوە بە تەواوی ئاسمان دەبیندرا! بەڵام ئەو ژنە جوانە هیچکات رازیی نەبوو و بەردەوام دەیبۆڵاند! بۆ وێنە بۆ ئەوە بۆڵەی دەهات کە کڵاوە نوێیەکەی زۆری لێ ناکاڵێتەوە! خزمەتکارەکەی پێشووی مانگێک بوو چووبۆوە بۆ پشوودان و هیچ هەواڵێکی لێی نەبوو! هەر بۆیە دایکی کچۆڵەکە جێگای ئەو خزمەتکارەی گرتبۆوە! لە سەعات نۆی بەیانیەوە هەتا یەکی دوانیوەڕۆ لەوێ کاری دەکرد! هەر تەنیا لەو ماوەیەدا لە هاوسەرەکەی دوور دەکەوتەوە و کچۆڵەکەشی لە گەڵ خۆی دەبرد! دەیگوت مانەوە لە هەوای ئازاددا لەوە باشترە کە لە لای پیرەپیاوێکی نەخۆش بێ! کچۆڵەکەی بە پێی پەتی دەبرد! ڕێگایەکی دوور و درێژ لە کوچە و کۆڵانە بێ سەر و بنەکاندا! لە نێو ڕێگادا دایکی کچۆڵەکە بیری لەوە دەکردەوە کە ئەمڕۆ دەبێ لە گەڵ کام یەک لە خەمە پڕ و پوچەکانی ژنی خاوەن ماڵ هاودەردی بکات! بە لە لێدانی زەنگی ماڵەکە بە خۆی دەگوت:

ـ ورەت بەرز بێت!

کەسێک بە بێتاقەتی وەڵامی زەنگەکەی دەدایەوە و دواتر دەنگی هەنگاوە بێوازەکان لەو دیوی دەرگاکەوە دەبیسترا و کاتێک دەرگاکە دەکرایەوە ژنەکە بە جلێکی درێژی خەوەوە دەهات دەرگاکەی دەکردەوە! جاری وابوو ڕەنگی جلەکە سپی بوو، جاری وابوو پەمەیی و جاری واش هەبوو ئاسمانی

بووا کاتێک دەچوونە ژوورەوە بە سەر فەرشی جۆراوجۆردا دەڕۆیشتن! دواتر دایکی کچۆڵەکە ئەوی وەکو پاکەتێک لە سەر کورسییەک دادەنا و پێی دەگوت بزۆزی نەکات و قسەش نەکات! ئەو کات دەچوە چێشتخانەکە و خەریکی شتوشۆری قاپ و قاچاخەکان دەبووا ژنە دەوڵەمەندەکەش بە پێچەوانەی ئەو لە سەر قەنەفەیەک پاڵی دەدایەوە و هەروا کە دارجگەرەکەی بە لا لێوەوە بوو، ڕۆژنامەشی دەخوێندەوە! هەر دەتگوت هیچکارێکی دیکەی نییە! کچۆڵەکە نەیدەزانی داخوا بۆچی بۆخۆی قاپ و کەوچکەکان ناشوات و داوا لە دایکی دەکات کە بە سکی پڕەوە ئەو کارە بکات!

ئەو ڕۆژە ژنە دەوڵەمەندەکە بۆ بڕێک حیساب و کیتاب سەری لێ شێوا بووا لە کاتێکەوە کە دایکی کچۆڵەکە خەریکی شۆردنی قاپ و کەوچکەکان بوو دەستی کردبوو بە ناڵە ناڵ هەتا کاتێک کە دایکی کچۆڵەکە خەریکی تەپ و تۆز پاککردنەوەی شتەکان بوو، هەروا دەیگوت:

ـ لەوە زیاترم ناداتێ! تێدەگەی؟

کاتێک دایکی کچۆڵەکە وەڵامی دایەوە:

ـ ئەگەر ئەو پارەیە هی من بوایە هەستم دەکرد شازادەیەکم!

ئەو توڕە بوو و گوتی:

ـ ئەو پارەیە بەشی کرێی سەیارەکەشم ناکات! خۆ تۆ نابێ خۆت لە گەڵ من هەڵسەنگێنی!

دایکی کچۆڵەکە سوور هەڵگەڕا و بە بیانووی خاوێن کردنەوەی فەرشەکە دووڵا هاتەوە و رووی لە زەویەکە کرد! کچەکە هەستی کرد شتێک بەری گەرووی گرتوە! دەیویست فرمێسکەکەی پاک بکاتەوە کە هۆشی چوو بۆ لای شتێک کە لە بەر خۆرەکە دەدرەوشایەوە! جێگە شوکلاتێکی شوشەیی کە پڕ بوو لە شوکلات! شوکلاتی گەورە گەورە کە دووسێ بەرابەری ئەوانە دەبوون کە لە ماڵە کۆنەکەی خۆیان دەیخواردن! ئێشی گەرووی لە بیر چۆوە و تامی شوکلات جێگاکەی گرتەوە! دایکی زانی و خۆی لێ مۆڕ کردەوە و تێیگەیاند کە ئەگەر شتێکی بوێ، دواتر پەژیوان دەبێتەوە! کچۆڵەکە زانی و لە میچی خانوەکە راما! هێشتا هەر لەو خەیاڵانەدا بوو کە ژنە جوانەکە هەستا و چوە هەیوانەکە و دەستی بە جمگە دەستی خۆیدا دێنا! ئەو هەیوانە کەوتبوە سەرووی هەیوانێکی دیکە کە دوو بەچکە دەوڵەمەند لەوێ خەریکی کایە کردن بوون! کچۆڵەکە دەیزانی کە ئەوان دەوڵەمەندن و چونکە پێشووتریش بینیبوونی دەیزانی کە زۆریش جوانن! ئەوانیش بە قەدەر خاوەنکارەکەی دایکی جوان بوون! ژنە دەوڵەمەندەکە کە هەروا دەستی بە جمگە دەستیدا دێنا، چاوی پێکەوتن! بزەیەکی هاتێ و چوە پێشەوە بۆ ئەوەی بانگیان بکات:

ـ سڵاو کۆترە بچکۆلانەکانی من! ئەمڕۆ چۆنن؟

دواتر گووتی:

ـ راوەستن ئەمڕۆ شتێکم بۆ هێناون!

دواتر هاتە ژووریَ و جێگە شوکلاتە شوشـەییەکەی بـە وریاییـەوە هـەڵگرت بۆ ئەوی نەکا لە دەستی بەر بێتەوە و دواتر چۆوە هەیوانەکە و دەستی کرد بە فرێدانی شوکلات بۆ منداڵەکانی!

شوکلاتەکانی بۆ دەهاویشتن و دەیگوت:

ـ ئەوەش شوکلات بۆ کۆترە بچکۆلەکانم! کۆترە بچکۆلەکانی خۆم!

هەروا بەدەم پێکەنینەوە نیوەی شوکلاتەکانی بۆ هاویشتن و دواتـر گەڕایـەوە و لـە سـەر مێزێـک دایـنـا! بـۆ خۆشـی دانەیـەکی هـەڵگرت و کاغـەزە ئاڵتونیەکـەی لێکـردەوە و لـە سـەر خـۆ لـە دەمـی هاویشـت و چـوە نـاو خەیاڵاتـەوە! دیـار نـەبوو بیـری لـە چـی دەکـردەوە! وردە وردە مـژی و لـە دواییشدا قوتی دا ... و کچۆڵە بچکۆلەکەش هەروا تێی رامابوو!

هەر لەو رۆژەوەیە کە من ئیتر ناتوانم شوکلات بخۆم! ئەگەر بیخۆم تێک دەچم! هیوادارم تۆش حەزت لـە شـوکلات بێت، چونکە دەمهەویَ کۆڵێک شوکلاتت بۆ بکرِم! دەمهەویَ چوار دەورت پرِ بکەم لە شـوکلات بـۆ ئـەوەی لە جیاتی منیش هەتا پێت خۆش بوو، هـەتا کاتێک کـە مـن بیرەوەریـی ئـەو زوڵمـە لـە یـاد دەکـەم، شـوکلات بخـۆی! تـۆ هـەر بـەو چەشـنە کـە لەگـەڵ تووندوتیژی ئاشنایەتی پەیدا دەکەی، تامی زوڵمیش دەچێژی! دەبیَ خـۆت ئامادە بکەی! باس لەو زوڵمە ناکەم کە لە کاتی سەربرِینی جوجەڵەیـەک بـۆ خـواردن، یـان گایـەک بـۆ کـەوڵ کـردن، یـان ژنێـک بـۆ تـەمبیَ کـردن روودەدات! مەبەستم زوڵمێکەکە دارا و نەدار لێک جیا دەکاتـەوە! زوڵمێـک کە تامی ژەهری بەو کچۆڵەیـە چێشت کاتێک کـە دایکـە دووگیانەکـەی بـە

سەری شۆڕەوە خەریکی خاوێن کردنەوەی فەڕشەکە بووا نازانم چۆن دەکرێ لە گەڵ ئەو ستەمە بجەنگی؟ ئەوان ویستیان ئەو کارە بکەن، بەڵام کەسێک کە فەڕشەکانی خاوێن دەکردەوە گۆڕیان! لە هەر نیزامێکدا کە لە دایک ببی و مرۆڤەکانیشی لە سەر هەر دینێک بن، هەمدیسان ژنێکی دووگیان هەیە کە فەڕشەکان خاوێن دەکاتەوە و کچۆڵەیەکی چکۆلەش هەیە کە بۆ خواردنی شوکلاتێک سوکایەتی پێدەکرێت! هیچکات نیزامێک نادۆزیتەوە کە بتوانێت ئاڵوگۆڕ لە دڵی مرۆڤەکاندا پێک بێنێت و رق و بێزاری لە دڵیان دەرباوێت! هەرکەس پێی گوتی: لە وڵاتی ئێمەدا عەداڵەت هەیە! تۆ پێی بڵێ درۆزن و داوای لێبکە پێت بسەلمێنێت کە لە وڵاتەکەیدا خواردنی تایبەتی دەوڵەمەندان و هەژاران جیا نییە! زستان وەرزی دەوڵەمەندەکانە! ئەگەر دەوڵەمەند بی سەرما بۆ تۆ گەمەیەکە کە دەتوانی بە باڵتۆی پەشمین چارەسەری بکەی و گەرمت ببێتەوە و خلیسکەش بکەی! ئەگەر هەژار بی، سەرما بۆ تۆ بەڵایەکی ئاسمانییە! ئەوکات فێر دەبی کە چۆن لە دیمەنە بە بەفر داپۆشراوەکان بێزار بی!

بچکۆلەکە! بەرابەری تەنیا لەو جێگایەدا هەیە کە تۆی تێدای! ئازادیش هەروا! بەڵام ئایا بە راستی پێویستە بۆ تۆ کە کۆیلەی هیچ کەسێک نی، لە دایک ببی و تەواوی ئەو زوڵمانە تەحەمول بکەی؟

***

نازانم ئەوە چیرۆکە یان نا، بەڵام بۆتی دەگێڕمەوە!

ڕۆژێک بوو، ڕۆژێک نەبوو، کچۆڵەیەکی چکۆلە بوو کە باوەڕی بە داهاتوو هەبوو! هەموان هانیان دەدا سوور بێ لە سەر بۆچوونەکەی و بەردەوام پێیان دەگوت کە ڕۆژێکی لە ئەمڕۆش باشتر دادێت: قەشەکە باسی بەهەشتی دەکرد و دەیگوت هەمیشە سبەینێ لە ئەمڕۆ باشترە! لە قوتابخانە پێیان دەگوت، مرۆڤ خەریکە بەرەو پێش دەچێت! ئەو مرۆڤانەی کە لە سەرەتادا لە ئەشکەوتەکاندا دەژیان، سەرەتا چوونە ناو ماڵە بێ سۆبەکانەوە و دواتر وردەوردە توانیان گەرمای بۆ دابین بکەن! هەر ئەوە دەریدەخات کە هەمیشە سبەینێ لە ئەمڕۆ باشترە! باوکی نموونەی مێژوویی دێنایەوە و دەیگوت کە هەمیشە دەسەڵاتدارە زاڵمەکان لە کۆشکی پاشایەتی خراونەتە خوارێ و ئەوە دەرخەری ئەوەیە کە داهاتوو لە ئێستا باشتر دەبێ! کچۆڵەکە هەر زۆر زوو گومانی خستە سەر قسەکانی قەشەکە! ڕۆژی دواتر قەشەکە مرد و بۆ کچەکەش ئەوە سەرنجڕاکێش نەبوو کە دوای مردن لە میوانخانەیەکی ڕازاوە بە ناوی بەهەشت دا بژیت! وردە وردە تێگەیشت کە قسەکانی قوتابخانەش هەر هیچ نەبوون، چونکە هەمیشە لە زستاندا دەست و قاچەکانی بە سەرما دەقەڵشین! بەڵێ! ئەوە شتێکی باش بوو کە مرۆڤەکان توانیبوویان خۆیان لە ئەشکەوتەوە بگەیەننە ئەو ماڵانەی کە هەموو ژوورەکانی وەکو یەک گەرم دەکران، بەڵام لە ماڵی ئەواندا تەنانەت سۆبەشی تێدا نەبوو! کچۆڵەکە باوەڕی بە قسەکانی باوکی کرد! باوکی پیاوێکی بوێر و بەهێز بوو! بیست ساڵ بوو لە گەڵ زاڵمانی ڕەشپۆش بە شەڕ دەهات و هەموو جارێک کە بە لێدان شین و مۆریان دەکردەوە، بوێرانە دەیگوت:

ـ هەر وا نامێنێ!

ئەو کات سەردەمی شەڕ بوو و واپێدەچوو کە زاڵمە ڕەشپۆشەکان هەتا هەتایە دەمێننەوە، بەڵام باوکی کچۆڵەکە بەردەوام ئەو قسەیەی دووپات دەکردەوە کە:

ـ هەر وا نامێنێ و ئاخرەکەی ڕۆژگارێکی تریش دێت!

کچۆڵەکە لە یەکێک لە شەوەکانی مانگی ژوئیەدا، قەناعەتی بە قسەکانی باوکی کرد! ئەو شەوە خەڵکی زاڵمەکانیان وەدەر نان و واپێدەچوو کە شەڕ تەواو بوە و ئەوا ئەو ڕۆژەی کە باوکی ئاماژەی بۆ دەکرد، هاتوە! بەڵام لە مانگی سێپتامبردا زاڵمەکان گەڕانەوە و ئەمجارە کۆمەڵێک زاڵمی دیکەش کە بە زمانی ئاڵمانی قسەیان دەکرد، لە گەڵیان بوون! شەڕەکە خراپتر لە پێشوو دەستی پێکردا!

کچۆڵەکە پێیوابوو کلاویان لە سەری ناوە! لە باوکی پرسی و ئەویش گوتی:

ـ ڕۆژگار هەر وا نامێنێ!

و لە درێژەدا گوتی:

ـ زۆری نەماوە چونکە زۆر کەس چاوەڕوانی دەکەن!

هاوڕێکانی ئەوان لە ناو ڕێگادا بوون! ئەرتەشێکی دۆست بە ناوی متفقین. سبەینێی ئەو ڕۆژە هەر ئەو شارەی کە کچۆڵەکە تێیدا دەژیا بە دەستی هەر ئەو دۆستانەی کە ناویان متفقین بوو بۆمباران کرا و تەنانەت بۆمبێکیش

هەر ڕێک لە بەر دەرگای ماڵەکەی ئەوان تەقیەوە! کچۆڵەکە کە مات بوو، پرسی:

ـ ئەگەر ئەوانە دۆستن، ئەی بۆچی ئاوا دەکەن؟

باوکی وەڵامی دایەوە:

ـ بە داخەوە ناچارن! ئەم کارە هیچ شتێک لە دۆستایەتییان کەم ناکاتەوە! دواتر بۆ سەلماندنی قسەکانی کچۆڵەکەی برد بۆ بینینی دووکەس لە متفقین کە کاریان هاویشتنی ئەو بۆمبانە بوو و لە زیندانی زاڵمەکان ڕایانکردبوو!

باوک ئەوەی بە کچەکەی دەگوت کە دەبێ یارمەتییان بدەن، چونکە داهاتویەکی باش ئامانجی هاوبەشی هەموانە! کچۆڵەکە قەبوڵی کرد و هاوڕێ لە گەڵ باوکی کە بۆ ڕزگار کردنی ئەوان ئیعدامیشی لە خۆ گرتبوو، دەست بە کار بوون! حەشاری دان و خۆراکیی بۆ بردن و هەتا نزیک سنورەکەش وەکو چاو ساغێک لەگەڵیان چوو! دوای ئەو کارانە دانیشت و چاوەڕوانی ئەرتەشێکی دەکرد کە بڕیار بوو ئەو ڕۆژگارەی کە باوکی دەیگوت، بە دیاری بێنێت! ئەو ئەرتەشە وا وێدەچوو کە هیچکاتێک نەگاتێ! حەوتوەکان و مانگەکان تێدەپەڕین و مرۆڤەکانیش بە بۆمب و ئەشکەنجە دەمردن یان گوللەباران دەکران و داهاتوویەکی باشیش ئیتر ببوە خەیاڵ! باوکی کچۆڵەکەش گیرا و ئەشکەنجە کرا! کچۆڵەکە لە زیندان چوو بۆ سەردانی و هێندە دەموچاوی هەڵقرچابوو کە نەیناسیەوە! بەڵام باوکی هەر بەو سەروچاوە ئاوساوەوە پێی گوت:

ـ ئاخرەکەی رۆژگارێکی تریش دێت، رۆژگارێکی بە دوور لە سووکایەتی!

سەروچاوی باوکی لە کەسێکی غەریب دەچوو، بەڵام دەنگەکەی ناسیەوە! ئەو دەنگەی کە پێی دەگوت:

ــ ئاخرەکەی رۆژگارێکی دیکەش دێت. ئەو ئەو رۆژگارەی کە لەودا بێحورمەتی و سوکایەتی تێدا نییە!

ئەو رۆژەی کە چاوەڕوان دەکرا، هات! لە بەرەبەیانی یەکێک لە رۆژەکانی مانگی ئوت! شەوی پێشوو شاریان چاک بۆمباران کردبوو! پردەکان و جادەکان خراپ ببون و مرۆڤی بێتاوانیش زۆر کوژرابوون! لە گەڵ بیستنی دەنگی ناقوسی جەژنی پاک، متفقین گەیشتنە ئەوێ! ئەو فریشتانەی کە بە بزەوە و بە جلوبەرگی سەربازیەوە لە نێو خەڵکدا بە ریز دەڕۆیشتن و خەڵکیش گوڵی بە سەردا دەباراندن و هاواریان دەکرد: هەر بژی! باوکی کچۆڵەکە کە تازە ئازاد کرابوو، هەمووان ریزیان لێدەگرت و سۆمای خۆشی لە چاوانیدا دەدرەوشایەوە!

کەسێک هاتە لای باوکی و پێی گوت خێرا خۆی بگەیەنێتە ژووری فەرماندەی متفقین چونکە روداوێکی ناخۆش رویدابوو! باوکی کچۆڵەکە هەروا کە بە هەڵاتن دەڕۆیشت، لە خۆی پرسی: ئەو روداوە ناخۆشە دەبێ چی بێت؟

روداوە ناخۆشەکە پیاوێکی سی ساڵە بوو کە لە سەر دەم لە سەر چیمەنەکە راکشابوو و خەریکی گریان بوو! بۆ پێشوازیی لە دۆستان جلێکی شینی لە

بـەر کردبـوو و گـوڵێکی سـووری کاغەزیشـی لـە بـەرۆکی دابـووا لـە سـەر سەریشی فریشتەیەکی یۆنیفۆرم لە بەری چەک بە دەست لینگی لێک بڵاو کردبوون!

باوکی کچۆڵەکە دوولا هاتەوە و لە پیاوەکەی پرسی:

ـ چیت کردوە؟

پیاوەکە لە پرمەی گریانی دا و تەنیا توانی بڵێت کە:

ـ دایە ... دایە ... دایە ...

بـاوکی کچۆڵەکـە ویسـتی فەرمانـدەی متفقـین قسـە بکـات! فەرماندەکـە کـە کەسـێکی نێوچـاوان گـرژ و سـمێڵ سـوور بـوو، هـەروا کـە شـەللاقەکەی رادەوەشاند رووی لە باوکی کچۆڵەکە کرد و گوتی:

ـ ئێوە لەو کەسانەن کە خۆیان بە نوێنەری خەڵک دەزانن؟

باوکی کچۆڵەکە وەڵامی ئەرێی دایەوە و فەرماندەکە گوتی:

ـ کەواتە پێت دەڵێم کە میللەتی ئێوە بە دزی پێشوازییان لە ئێمە کردا ئـەم کابرایە دزی کردوە!

باوکی کچۆڵەکە پرسی:

ـ چی دزیوە؟

فەرماندەکە وەڵامی دایەوە:

ـ کۆڵەپشتییەکی پڕ لە خۆراک و بەڵگە و سەنەد!

باوکی کچۆڵەکە گوتی:

ـ بەڵگە و سەنەدی چۆن چۆنی؟

فەرماندە شەللاقەکەی راوەشاند و گوتی:

ـ دەفتەری گیرفانی خاوەن کۆڵەپشتییەکە!

باوکی کچۆڵەکە پرسی:

ـ دەفتەرەکەتان دۆزیەوە؟

فەرماندە گوتی:

ـ بەڵێ بەڵام دڕاوە!

باوکی کچۆڵەکە چاوێکی لە دەفتەرەکە کرد و بینی کە بە هاسانی چاک دەکرێتەوە و پرسی:

ـ ئەی خۆراکییەکە؟ خۆراکییەکەشتان دۆزیوەتەوە؟

ـ خۆراکییەکەی خواردوە!

شەللاقی فەرماندەکە وشەوشی دەهات! باوکی کچۆڵەکە بە بزەوە گوتی:

ــ ئەو پیاوە کارێکی باشی نەکردوە! من وەکو نوێنەری خەڵک بەڵێنتان پێدەدەم، خەسارەتەکەتان بۆ قەرەبوو بکەمەوە!

فەرماندەکە سەر لە نوێ شەللاقەکەی بەرز کردەوە، گوتی:

ـ لە ئەرتەشی ئینگلیس دا دزەکان گوللەباران دەکەن! نوێنەری خەڵکیش چاوی دەرێت!

دزەکە سەری خستبوە نێو چیمەنەکەوە و هەر دەگریا و دەیگوت:

ـ دایە ... دایە ... دایە ...

فریشتە یۆنیفۆرم لەبەرەکە هەروا لە سەر سەری لینگی لێک کردبوونەوە و چەکەکەی لە سەر پشتەملی راگرتبوو! کاتێک کچۆڵەکە لە گەڵ باوکی لەوێ دوور کەوتنەوە گوێیان لە تەقەیەکی بەرز بوو! دەنگی میل هێنانەوەی چەکەکە ...

کچۆڵەکە هیچکات نەیزانی کە ئەو دزەیان گوللەباران کرد یان نا؟ بەڵام لەو کاتە بەدواوە هیچ هیوایەکی بە داهاتوو نەما! چونکە هەر ئەو وشەی داهاتویەکی باش، کە ئەوی بە دۆستەکانیەوە پەیوەند دابوو، لە وانیشی کرد!

دوای ئەرتەشی ئینگلیس، ئەرتەشی ئامریکا هات! هەموان دەیانگوت ئامریکاییەکان باشترن! کچۆڵەکە ئاواتەخواز بوو کە ئەو قسانە راست بن! ئامریکاییەکان هەمیشە پێدەکەنین و دەنگەدەنگیان دەهات! کچۆڵەکە زۆر زوو تێگەیشت کە ئەوان هەر بەو پێکەنینەیان دەیانهەوێ خۆیان لە بەر

چاوی هەموان خوێن شیرین بکەن و خۆیان بە سەر هەمواندا بسەپێنن! ترسێکی دیکە جێگای سبەینێی گرتەوە! برسێتیش هەروەکو خۆی مابۆوە! ژمارەیەک لە ژنەکان بۆ تێر کردنی سکیان دەستیان کردبوو بە لەشفرۆشی! ژمارەیەکیش خزمەتی دەسەڵاتدارە نوێیەکانیان دەکرد و دەیانشۆردن! تەواوی هەیوانەکان و سەربانەکان پڕ ببون لە یۆنیفۆڕم و شۆرت و گۆرەوی دەسەڵاتدارە ئامریکاییەکان! هەر کەسێک کە زۆرتری بشۆردبایە، خۆراکی زیاتریشی وەردەگرت:

شەش جووت گۆرەوی= نانێک

سێ بلوز= قتویەک گۆشت و لوبیا

قاتێک یۆنیفۆڕم= دوو قتو گۆشت

باوکی کچۆڵەکە نەیدەهێشت ئەو و دایکی دەست لە جلوبەرگی ئامریکاییەکان بدەن!

دەیگوت:

ـ چ باش بێ و چ خراپ! ئەو رۆژگارەی کە چاوەڕوانیم دەکرد ئەوە هاتوە و دەبێ لە گەڵی رابێین!

بۆ سەلماندنی قسەکانی هاوڕێکانی دەعوەت کرد و لە بەشە خۆراکی خۆیانی دەدانێ!

شەوێک دوای کۆڵێک قسەکردن سەبارەت بە هاوڕێ بوێرەکانی کە لە زیندانی زاڵمەکان رایانکردبوو و سەبارەت بە داهاتوویەک کە هی هەموان بوو، سەعاتە زێڕەکەی دەستیشی وەک دیاری دا بە ئەوان! هاوڕێکانیشی سەعاتە زێڕەکەیان لێ وەرگرت و لە بەرامبەریشدا کۆڵێک جلوبەرگی نەشۆراویان دایە! کچۆڵەکە زۆر پەشۆکا! برسێتی گوشاری زۆری هێنابوو! چەند رۆژ دواتر کچۆڵەکە بێ ئەوەیکە باوکی ئاگای لێی بێت، چوو کۆڵێک جلی چڵکنی هێنان بیانشۆرێت! دوو کیسەیان دانێ! یەکێکیان جلی چڵکن بوون و ئەوی تریشیان خۆراکی! خێرا کیسەیەکیانی کردەوە! سێ قتو لۆبیای کولاو، دوونان، بەستەیەک بادام و بەستەنییەک! دواتریش کیسەی جلە چڵکنەکانی کردەوە! کاتێک رۆی کردنە نێو تەشتەکەوە، زۆر تووڕە بوو! کیسەکە پڕبوو لە شۆرتی پیسی سەربازەکان! لە کاتی شۆردنی ئەو شۆرتانەدا بوو کە زانی هێشتا رۆژگارێکی باشتر نەهاتوە و لەوانەیە هیچکاتێکیش نەیەت!

هەمیشە بە وەعدە و بەڵێنی خافلاندوویانین! بە هێندێک فێڵ و تەڵەکە و درۆ کە جلکی هیوایان لە بەر کردوون هەتا ئێمەیان پێ هێوەر بکەنەوە!

بچکۆلەکە! بە راستی داهاتووی من و تۆ هەڵدێت؟

بە میلیۆن ساڵە مرۆڤەکان بە هیوای گەیشتن بە داهاتوو منداڵیان دەبێ و هیوادارن منداڵەکانیان داهاتوویەکی باشتریان هەبێت! ئایا ماڵێکی گەرم و گوڕ بە تەنیا بەسە بۆ ئەوەی خۆشبەخت بی؟ کاتێک کە لە سەرما هەڵدەلەرزی ئەو گەرمایە شتێکی باشە، بەڵام ئەوە ناتوانێ خۆشبەختت بکات و داکۆکی لە ئابڕووی تۆ بکات! تەنانەت بە بوونی ماڵێکی لەم

چەشنەش دەبێ درۆکان و فێڵ و تەڵەکەکان تەحەمول بکەی و داهاتووی باش دیسانەوە هەر درۆیە! پێشووتر پێمگوتی کە هیچ شتێک لە نەداری خراپتر نییە، نابێ لە ئێش و ئازار یان لە مردن بترسی، چونکە کەسێک کە دەمرێ، بە دڵنیاییەوە دەبێ پێشووتر لە دایک بووبێ! پێشووتر پێمگوتی کە عەزابی لە دایک بوون لە بێدەنگی و نەبوون باشترە! بەڵام ئایا بە راستی ئەم قسانە راستن؟ بچکۆلەکە! ئایا دەکرێ تۆ لە بۆمباراندا یان بە گوللەی کەسێک بمری کە بەشە خۆراکەکەت دزیوە؟ هەرچی گەورەتر دەبی! من زیاتر دەترسم! زەوقی جارانم بۆ گەیشتن بە تۆ نەماوە! هەموو رۆژێ زیاتر لە رۆژی پێشوو تووشی گومان دەبم! گومانێک کە وەکو هەڵکشان و داکشانی دەریا لە ناخمدا سەروخوار دەکات، جاری وایە تەواوی جەستەم تەڕ دەکات و جاری واش هەیە دادەکشێت و تەنیا ئاسەوارێک لە خۆی بە جێدێڵێت! نامهەوێ هێوا بڕاوت بکەم! باوەڕ بکە نامهەوێ هانت بدەم بۆ ئەوەی لە دایک ببی! تەنیا دەمهەوێ پێت بڵێم کە چ بەرپرسیارێتییەکم لە ئەستۆیە و دەمهەوێ تۆشیان تێدا بەشدار بکەم! بچکۆلەکە! هێشتاش مەجالی بیرکردنەوەت هەیە! چ گرفتەکانم لە سەرێ بن و چ لە خوارێ مابنەوە من بۆ هاتنی تۆ خۆم ئامادە کردوە! بەڵام ئەی بۆ خۆت؟ ئامادەی چاوت بە ژنێک بکەوێ کە بەر دەبێتەوە سەر درەختی ماگنۆلیا و دەمرێ؟ ئامادەی بارانی شوکلات بە سەر سەری کەسانێکدا ببینی کە هەر حەزیان لە شوکلات نییە؟ ئامادەی شۆرتە پیسەکانی کەسانێکی دیکە بشۆری و تێبگەی کە داهاتوو هیچ جیاوازییەکی لە گەڵ رابردوو نییە؟ لەو شوێنەی تۆ، دوێنێت سبەینێیە و سبەینێشت سەرکەوتنە! تۆ هێشتا نازانی تاڵترین

راستییەکە کامەیە! ئەو راستییە کە جیهان دەگۆڕێت، بەڵام هەموو شتێک هەر وەکو رابردوو دەمێنێتەوە!

***

حەوتووی دەهەم! بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر گەورە دەبی! پازدە رۆژ لەمەوبەر باڵات نەدەگەیشتە سێ سانتی مەتر و کێشیشت هەشت گرەم بوو! کامڵ بووی! لەو ماسیە چکۆلەیەی پێشوو تەنیا کۆ ئەندامی هەناسەت ماونەتەوە بۆ ئەوەی بتوانی لە نێو ئاودا هەناسە هەڵێنیەوە! ئاوەکە دەنێریە بۆریەکانی هەناسەوە و دیسانەوە دەری دەدەیەوە! ئێسقانەکانت خەریکە خۆ دەگرن و کرکراگەکانیشت قایمتر دەبن و پەراسوەکانیشت لە پێشەوە وێک دەکەونەوە! جەستەت وەکو باڵتۆیەکە کە لە پێشەوە دوگمەی هەن و بە هەر رادەیەک پێستەکەت زیاتر گەشە بکات، ئەو باڵتۆیە تەسکتر دەبێتەوە! هەر زۆر زوو دەست دەکەی بە تەقالا و جموجۆڵ! بۆ یەکەمین جار دەست و قاچەکانت دەجوڵێنی! هەنیشک و ئەژنۆکانت لێرە و لەوێ دەکوتی! منیش چاوەڕوانی ئەوەم! ئەو خۆ تێکوتانە یەکەم ئاماژەیە! نیشانەی رازی بوونە! لە بیرتە بۆم باسکردی کە منیش هەر ئەو کارەم کرد هەتا دایکم تێبگەیەنم کە ئەو دەوا تاڵە نەخوات؟

چاوەڕوانیی من بە پێچەوانەی گەورە بوونی تۆیە! هەرچی ئەو چاوەڕوانییە زیاتر بێت، تۆ گەورەتر دەبی! من وەبیر ئەو ئەرتەشە دەخەیتەوە کە هیچکات نەدەگەیشتێ! ئەو چەشنە بیرکردنەوانە سەرچاوەکەیان جموجۆڵ نەکردنە! دوو حەوتوویە کە لە نێو جێدا کەوتووم و ئەم ساتانە زۆر دوور و درێژن بە لامەوە! ئەی ئەو ژنانەی کە دەبێ حەوت هەشت مانگ لە جێدا

بکـەون، چـی دەچێـژن؟ ئـەوان ژنـن یـان کـرمن؟ تـەنیا شـتێک کـە ئـارامم دەکاتەوە هەر ئەوەیە! ئیتر هیچ باسێک لە زەبری ئەو ئێش و ئازارانـەی کـە وەکو چەقۆ لە ژێر سکم دران، نییە! دڵیشم تێکەڵ نایەت! قاچەکانیشـم ئیتـر نائاوسێن، بەڵام چەشنێک لە بێوازی و نیگەرانی جێگاکـەی گرتۆتـەوە! نـازانم بۆ! رەنگە هەر هی ئەو جموجۆڵ نەکردنە بێت! هـەتا ئێسـتا هیچکات بێکـار نـەبووم و نەمـدەزانی بـێ تاقـەتی چییـە! چـاوەڕوانم هـەتا دوایـین رۆژەکـانی پشـووم تـەواو ببێـت! ئـەو دوو رۆژەی کـە هەسـت دەکـەم دوو ساڵە! ئـەم بەیانییە لە گەڵت بە شەڕ هاتم! نارەحەت بووی؟ شێت ببووم! پێم گوتی کە منیش مافی خۆمە و هیچکەسێک و تەنانەت تۆش ناتوانی ئەو مافـە لـە بـەر چاو نەگری! بە سەرمدا قیژاندی و وتم کە هیلاکم و تاقـەتم نـەماوە! گوێـت لێیە؟ چونکە چاوەکانت هەڵنـەهێناوە هەست دەکـەم کە ناتهـەوێ گـوێ لـە قسەکانم رابگری و هەر بۆشت گرینگ نییە!

هەستە لەخـەو! ناتهـەوێ هەسـتی؟ کەواتـە وەرە ئێـرە! وەرە لای مـن! سـەرە بچکۆلانەکەت بخەرە سەر سەرینەکەم! با لـە لای یـەکتری بخـەوین! مـن و تۆ، من و تۆ، من و تۆ ...

هیچکەسێکی دیکە نایەتە سەر جێگاکەمان!

ئـەو هـات هیچکاتێـک پێمـوانـەبوو بگەڕێتـەوە! دەرگاکـە کرایـەوە و پێموابـوو هاوڕێکەم هاتوە! ئەو هەموو شەوێک بەر لە نانخواردن، دێتە دەیدەنیم! دڵنیا بووم کە ئێستا بە هەناسەبڕکێ و بە پاکەتێکەوە دێت و دەڵێت:

ـ ببورە، بە پەلەم! گۆشتی سارد و میوەم بۆ هێناوی! سبەینێ دەتبینمەوە!

بەڵام کەسێک خەریک بوو بە ئەسپایی لە سەر پەنجەی پێی دەڕۆیشت! لە سەر جێگاکەم وەرسوڕام و دیتم کە خۆیەتی! نێوچاوانی هەڵقرچابوو و چەپکە گوڵێکیشی بە دەستەوە بوو! سەرەتا هەستم کرد یەکێک بە سکم دانوساوە! ئێشەکەی وەکو جاران نەبوو! هەر وەک ئەوەی لە بینینی ترسابێ مستت لێدەدام و دەتهەویست لە پشت دڵ و ریخۆڵەکانمەوە حەشارت بدەم! هەناسەم راوەستا و هەوایەکی سارد، جەستەمی لەرزاند! تۆش هەستت پێکرد؟ تۆش نارەحەت بووی؟

بێ ئەوەیکە هیچ قسەیەک بکات، بە نێوچاوانی تێک چرژاو و بە چەپکە گوڵێکەوە هەر لەوێ راوەستابوو! حەزم لەو سەر و سیما و گوڵانە نەبوو! بۆ وەکو دزێک هاتبۆ سەر سەرم؟ بۆ نەیدەزانی کە نابێ ژنە دووگیانەکان بترسن؟ لێم پرسی:

ـ چیت دەوێ؟

بە هێواشی گوڵەکانی لە سەر جێگاکە دانا! گوتم گوڵ لە سەر جێ دانان زۆر مەیمەنەتی باش نییە، چونکە گوڵ دەخەنە سەر تابوتی مردوو! گوڵەکان زەرد ببوون و دەمزانی کە لە دوایین ساتدا و بە بێ هیچ هەستێک ئەوانی کڕیون! بە بێ جووڵە راوەستابوو و سێبەرە رەش و زەلامەکەی دیواری ژوورەکەی داپۆشیبوو! چاوی لێ نەدەکردم! چاوی لە وێنەکانی سەر دیوارەکە دەکرد! هەر ئەوانەی کە تۆیان لە دوو مانگیدا نیشان دەدا! هەر ئەوانەی کە چل جار گەورە کرابوونەوە! دەتگوت ناتوانێ چاوی لە سەر

چاوانت هەڵبڕیَ! هەر چی زیاتر لێی دەڕوانی، زیاتر خۆی کوشمەڵە دەکرد! ئاخرەکەی دەستی بە دەموچاوی گرت و دەستی بە گریان کرد! سەرەتا بە بێدەنگی دەگریا! وردە وردە دەنگی بەرز بۆوە! لە سەر لێواری قەرەوێڵەکە دانیشت بۆ ئەوەی ئاسودەتر بگریت! گریانەکەی قەرەوێلەکەی دەلەراندەوە! هەستم کرد ئەو لەرینەوەیە ئازارت دەدات! پێم گوت:

ـ خەریکی قەرەوێڵەکە دەلەرێنیەوە! منداڵەکە ئەزیەت دەبیَ!

دەستەکانی لە سەر دەموچاوی هەڵگرت! چاوەکانی بە دەسماڵێک وشک کردنەوە و لە سەر کورسییەکە دانیشت! هەر ئەو کورسییەی کە لە ژێر وێنەکەی تۆ دامناوە! کە تۆی لە تەنیشت خۆی هەست پێکرد، مات بوو! تۆ بە پێڵوە بیَ جوڵەکانت و ئەویش بەو چاوانەی کە هیچ شتێکی شاراوەیان تێدا نەبوو! وتی:

ـ منداڵەکە هی منە!

لە داخا وەخت بوو بتەقم! لە سەر قەرەوێڵەکە تۆزێک خۆم بەرز کردەوە و هاوارم کرد کە تۆ نە هی منی و نە هی ئەوی! تۆ هی خۆتی! گوتم من بەو گاڵتەجاڕیانە و ئەو کارانەی کە عاشقەکان لە فیلمەکاندا دەیکەن، تێک دەچم! گوتم دوکتۆر پێی گوتوم ئارام بم و ئیسراحەت بکەم! هەر بە راست بۆچی هاتبوە ئەویَ؟ بۆ ئەوەیکە بێت و چەرمەسەریی تۆ لە کۆڵ خۆی بکاتەوە و بتوانیَ خەرجی لە باربردنەکەت بدات؟ چەند جار گوڵەکانم لە مێزەکە راکێشان! ئەوەندەم وا کرد کە گوڵەکان هەڵوەرین! کاتێک کە سەر لە نویَ سەرم کردەوە سەر سەرینەکەم، جلە خەوەکانم بە ئارەقە تەڕ ببوون

و ژانـه سـکیش ئـه‌مانی لـێ بڕیبـووم! بـه پێچه‌وانـه باوکـت هـه‌ر لـه سـه‌ر جێگاکه‌ی جوڵه‌شی نه‌کرد! ته‌نیا سه‌ری داخست و گوتی:

ـ زۆر دڵڕه‌قی! چۆن ده‌توانی هێنده به‌دفه‌ڕ بی؟

دواتر سه‌باره‌ت به‌وه‌یکه من خـه‌ریکم کڵاو لـه سـه‌ری خـۆم ده‌نـێم، کۆڵێـک قسه‌ی کرد و ده‌یگوت تۆ هی هه‌ردووکمانی و ئه‌ویش به قـه‌ده‌ر مـن بیـری له‌وه کردۆته‌وه و عه‌زابی کێشاوه و دوومانگه لـه بـه‌ر تـۆ ئه‌زیـه‌تی کێشـاوه و دواتر ده‌ستی کرد به هه‌ڵیت و پڵیت سه‌باره‌ت به‌وه‌یکه بڕیاره‌که‌ی مـن لـه مه‌ڕ راگرتنی تۆ به باش ده‌زانێت و نابێ منداڵ فڕێ بدرێت! چونکه منـداڵ، منداڵـه خـۆ خـۆڵ و خاشـاک نییـه و ... قسـه‌ی قـۆڕی دیکـه‌ی لـه‌م چه‌شـنه! قسه‌که‌م پێ بڕی و گوتم:

ـ خۆ منداڵه‌که له سکی تۆدا نییه؟ تۆ ناچار نی له کۆڵی بکه‌ی!

واقی وڕما و گوتی:

ـ پێموابوو تۆ منداڵه‌که‌ت خۆش ده‌وێت و ده‌تهه‌وێت بتبێت!

له‌و قسانه‌دا بووین که شتێک روویدا و هۆکاره‌که‌شی نازانم! له ناکاو گریـام! هه‌تا ئه‌و کـات نـه‌گریابووم! حـه‌زم نـه‌ده‌کرد بگـریم، چونکـه گریـان هـه‌م لـه پـێش چـاوی ئـه‌و سـوکی ده‌کـردم و هـه‌میش ناشـیرین! بـه‌ڵام هـه‌ر چه‌نـد ئه‌سـرینه‌کانم ده‌سـڕینه‌وه، خێراتـر بـه سـه‌ر کوڵمه‌کانمـدا ده‌بـارین! هه‌وڵمـدا جگه‌ره‌یه‌ک داگیرسێنم! ئه‌سرینه‌کانم جگه‌ره‌که‌یان ته‌ڕ کرد!

باوکت لە سەر جێگاکەی هەستا و هاتە سەر سەرم و دەستی بە سەرم داهێنا و گوتی:

ـ ئێستا قاوەت بۆ ئامادە دەکەم!

دواتر چوە ناو چێشتخانەکەوە! کاتێک گەڕایەوە من باشتر ببوم بەڵام ئەو تورە بوو! فنجانە قاوەکەی بە پارێزەوە بە دەستەوە گرتبوو! قاوەکەم خواردەوە و چاوەڕێ بووم ملی ڕێگا بگرێت و بڕوات! بەڵام نەڕۆیشت! پرسیاری کرد ئاخۆ چی دەخۆم؟ وەبیرم هاتەوە کە بە پێچەوانەی هەموو شەوێک دۆستەکەم نەهاتبوو! زانیم کە ئەو باوکتی ناردۆتە لام! رقم لێی بوو! لە ئەو و لە تەواوی ئەو کەسانەی کە پێیانوایە بە یاسا زۆرە ملەکانیان دەتوانن یارمەتی کەسانی دیکە بدەن!

مریەم زۆر باشە، هەم خۆی و هەم منداڵەکەشی! تەنیا شتێکی جێی پەسندی چیرۆکەکە هەر ئەوەیە:

" ئەفسانەی بە شکۆی ئەو جنینەی کە بە بێ خەوتن لە گەڵ هیچ کەسێک دروست بوە!"

پێم بڵێ بزانم لە چیرۆکی ئێمەدا هاوسەر بۆچی دەبێ؟ بە کەڵکی ڕاکێشانی وڵاخێک کە بە ڕێگادا ناڕوات؟ بڕینی ناوک و چاودێری بە سەر منداڵدا؟ یان ئاگاداریی لە ئابڕووی ژنێکی بێ هاوسەر کە دووگیان بوە؟ پێم بڵێ ...

باوکت لە سەر زەویەکە دانیشتبوو و خەریک بوو گوڵەکانی کۆ دەکردەوە! تەنانەت بە قەدەر نوکە دەرزییەکیش خۆشم نەدەویست! بە هاتنی ئەو

هاوسەنگیی نێوان من و تۆ تێکچووا! لەمپەرێکی لە نێوان ئێمەدا دروست کردبووا! تێدەگەی؟ غەریبەیەک پێی نابوە ناو ژیانی تایبەتیی ئێمەوە! غەریبەیەک لە نێوان ئێمەدا بووا! هەر رێک وەکو قەنەفەیەک کە هیچ پێویستییەکت پێی نییە بەڵام لە خۆڕا بەشێک لە دیوەکەت داگیر دەکات و دەبێتە کۆسپی سەر رێگات و تێی هەڵدەنگوی! رەنگە ئەگەر هەر لە سەرەتاوە لەگەڵمان بوایە، ئێستا بە لامانەوە ئاسایی دەبۆوە! بەڵام ئێستا رێک وەکو مرۆڤێکە کە سەری داخات و بێتە ناو رێستۆرانێکەوە و بێ ئەوەیکە دەعوەتی بکەی بێتە سەر مێزەکەت دابنیشێت!

تووشی عەزاب ببووم! دەمهەویست پێی بڵێم: تکات لێدەکەم بڕۆ! ئێمە پێویستمان بە تۆ نییە! نە بە تۆ، نە بە یوسف، نە بە خوا! هەر باوکمان ناوێت! هاوسەرمان ناوێت! تۆ زیادەی! بەڵام نەمدەتوانی! وەکو کەسێک کە ناتوانێ بەوەیکە لە سەر مێزەکەیان دانیشتوە، بڵێ لێرە دامەنیشە! پێموایە سکم پێی دەسووتا! بەڵام وردە وردە ئەو دڵسۆزیە وەکو ئاشتبوونەوەی لێهات! جیاواز لە هەموو کارە خراپەکانی، ئەویش لەم رووداوە نارەحەت بوو و تووشی عەزاب ببوو! نازانم چەپکە گوڵ کڕین و هاتنی بۆ ئەوێ چەندە دژوار بوە! لەوانەیە زۆری گوشار بۆخۆی هێنابێت هەتا بەو قەناعەتە گەیشتوە بێتە لامان! هیچکەس بە بێ تۆو لە دایک نابێ! ئەو دڵۆپە ڕووناکاییەی کە هێلکۆکەکانی کوون کردبوو، هی ئەو بوو! تۆ لە دوو بەش بەشێکت هی ئەو بوو! ئەوەی کە من و تۆ لە بیرمان کردبوو، حیساب کردنی نرخی یاسایەکە کە هیچکەس قەبووڵی نییە:

ژن و پیاوێـک پێکـەوە ئاشـنا دەبـن، حـەزیان لـە یـەکترە، یـەکتریان دەوێ، لەوانەیە عاشقی یەکتریش بن ... دوای ماوەیەک یـەکتریان خـۆش ناوێـت و حەزیان لە یـەکتری نامێنێت و خۆزگە دەخـوازن کـە یـەکتریان نەناسیبایە! ئەوەیکە بە دوایدا دەگەڕام، دۆزیبوومـەوە: منـداڵ، عەشقی نێوان ژن و پیاو وەکو بەهار و پاییزە! کاتێک عەشق سەرهەڵدەدات، بـەهار بـە گـەڵای سـەوز دادەپۆشرێ، بەڵام کاتێک کە دەمرێ بێجگە لە خەزان هیچ شتێک لە دوای خۆی بە جێ ناهێڵێ!

هێشتم خـواردنی شـەوم بـۆ ئامادە بکات! هێشتم ئەو شامپاینەی کـە بـۆی هێنابووم، هەڵیپچڕێ! ( لە کاتی هـاتنی بـۆ نـاو مـاڵ لـە کـوێ شـاردبوویەوە؟) هێشتم ئاوێک بە خۆیدا بکات! ( لە حەمامەکەدا فیتـووی لێدەدا و گـۆرانیی دەگـوت! دەتگـوت هـەموو کێشـەکەمان چارەسـەر بـوە!) هێشـتم لـە سـەر جێگاکەی ئێمـە بخـەوێت! بـەڵام ئـەم بەیانییـە دوای ڕۆیشـتنی، بـە تـەواوەتی خەجاڵەتیم کێشا! هەستم کرد بەڵێنەکەم شکاندوە و خەیانەتم پێکردووی!

خۆزگە جارێکی دیکە نەیەتەوە بۆ ئێرە!

***

دوای ئەو هەمووە لە نێو جێگادا مانەوە! هەست کردن بەو هەوایـەی کە لە دەموچاوت دەدات و شۆقی هەتاو کە لە چاوانـت دەچـەقێ! و لێڕوانینـی ئـەو خەڵکانەی کە بـە ژیـانی خۆیانـەوە نوساون! سەرنجڕاکێشـە! ئەگـەر ( بینگـە) عیـادەی دوکتۆرەکـە دوور نەبوایـە بـە پێیـان دەچـووم و لـە ڕێگـادا بـۆ خـۆم گۆرانیم دەگوتن! ناچار بـووم بـانگی تاکسییەک بکـەم! شـۆفێرێکی بـێ شـعور

بووا ئـەو جگـەرە بـۆن ناخۆشـەی کـە لـە لا لێـوی نـەدەکردەوە، تێکـی دەدام! هێنده خراپ شۆفێری دەکرد کە هەموو جارێ لە گەڵ ستۆپ کردن بە کورسی پێشەوە دادەدرام! دوای چەند دەقیقە کە بە سەر ڕۆیشتنەکەماندا تێپـەڕی، تووشـی دڵ ئێشـە بـووم و خۆشـحاڵیی دەمەوبەیانیشـم نـەما و سـەرگێژە هەمیشـەییەکەم تـووش بـۆوە! کاتێـک چوومـە ( بینگـە) عیـادەی دوکتۆرەکـە لەگـەڵ دە پـازدە ژنـی دووگیـان بـەرەوڕوو بـوم! سـکرتێری دوکتۆرەکە داوای لێکـردم چـاوەڕێ بکـەم و منـیش زیـاتر تـوڕە بـووم! پـێم خۆش نەبوو لەگەڵ ئـەو ژنـە سک هەڵمساوانە لـە ژوورێکدا دابنیشـم! هـیچ شتێکم وەکو ئەوان نـەبوو! سکم چکۆلـە بـوو هـەر دیـار نـەبوو کـە دووگیـانم! ئاخرەکەی چوومە دیوی دوکتۆرەکەوە! جلەکانم دانا و لـە سـەر قەرەوێڵـەی پشـکنینەکە ڕاکشـام! دوکتۆرەکـە بـە قامکـەکانی بـە شـوێن تـۆدا دەگـەڕا و منیشی ئازار دا! لە کۆتاییدا دەسکێشەکەی دانان و زۆر بە سارد و سڕیەوە پرسی:

ـ هەر بە ڕاستی ئەو منداڵەت دەوێت؟

باوەڕم نەکرد! گوتم:

ـ بەڵێ! بۆچی؟

ـ چونکە زۆربەی دایکەکان دەڵێن لە کاتی منداڵ دروست کردندا، ئاگایان لە خۆیان نەبوە و لە ڕاستیدا ڕازیی بە منداڵبوون نەبوون! دواتر هـەرچی لـە دەستیان بێت دەیکەن بۆ ئەوەی منداڵەکە لە دایک نەبێت!

نارەحەت بووم و بە دوکتۆرەکەم گوت کە بۆ دەردەدڵ لە گەڵ دەروونناس نەهاتومەتە ئەوێ! تەنیا دەمهەوێ بزانم کە تۆ (منداڵەکە) حاڵت چۆنە؟ شێوازی قسەکردنەکەی گۆڕا و زۆر ماقوڵانە گوتی:

ـ لەوانەیە هێندێک گیروگرفت هەبێت! هۆکارەکەشی هێشتا نادیارە!

دواتر درێژەی بە قسەکەیدا و گوتی:

ـ هەڵبەت بارودۆخی جنینەکە باشە و رێک لە سەر جێگاکەی خۆیەتی و بە شێوەیەکی ئاسایی گەشەی کردوە! بەڵام گرفتێک هەیە! منداڵدان زۆر هەستیارە و رەنگە هۆکارەکەشی هەر ئەوە بێت کە خوێنی تەواو ناگاتە ئەو بەشە لە منداڵدان ( پلاسنتا) کە لە رێگای ناوکەوە هەوا و خۆراک دەگەیەنێتە جنینەکە ...

تۆ ئیسراحەتی تەواوت کردوە؟

ـ بەڵێ!

جگەرە و مەشروبیشت نەخواردۆتەوە؟

ـ نا!

ـ کاری قورس چی؟

ـ نا!

ـ پەیوەندیی جنسیی چی؟

ـ لەم چەند حەوتوویەدا نا!

تۆ ئاگاداری کە راستم دەکرد! ئەو شەوە سەرەڕای ئەوە کە باوکت جەختی دەکردەوە، نەمهێشت دەستم لێبدات! دوکتۆرەکە تۆزێک بیری کردەوە و پرسی:

ـ نیگەرانی شتێکی؟

ـ بەڵێ!

ـ شتێک نارِەحەتی کردووی؟

ـ بەڵێ!

پرسیاری نەکرد داخوا نیگەرانی چیم و چی نارِەحەتی کردووم! دواتر گوتی:

ــ نیگەرانی و مشەوەش بوون و کاریگەرییە دەروونییەکان لە سەر ژنی دووگیان، زیاتر لە کاریگەریە جەستەییەکان کاری تێدەکەن و دەبێتە هۆی ئەوەیکە منداڵدان بە توونەدی وێک بێتەوە و ژیانی کۆرپەلەکە بکەوێتە مەترسیەوە! دەبێ ئەوەمان لەیاد نەچێ کە منداڵدان لە گەڵ غودەی هیپۆفیز (Hypophyse) لە پەیوەندی دایە و هەر هۆکارێک کە غوددەی هیپۆفیز هەڵخرِێنێ، خێرا لە سەر کۆئەندامی زاوزێ کاریگەری بە جێدێڵێت! توورِەیی، نارِەحەتی دەروونی و رووداوێکی ناخۆش دەبێتە هۆی ئەوەیکە کۆرپەکە لە ناکاو لە دیواری منداڵدان جیا بێتەوە و بکەوێتە مەترسییەوە! توورِەیی بەردەوامیش بۆ کۆرپەلە زۆر مەترسیدارە ...

هێوری و لەسەرخۆ بوون تەنیا دەوایەک بوو کە دوکتۆر بۆی نوسیم! پێم گوت:

ـ ئەو بڕیارەی تۆ وەک ئەوە وایە کە داوام لێبکەی ڕەنگی چاوانم بگۆڕم! سروشتم ناهێڵێ لە سەر خۆ و ئارام بم!

زۆر بە بێوازی وەڵامی دایەوە:

ـ ئەوە ئیتر پەیوەندیی بە خۆتەوەیە! لانیکەم هەوڵبدە تۆزێک قەڵەو بی!

دواتریش چەند دانە حەبی بۆ نوسیم بۆ ئەوەی ماسولکەکانم گرژ نەبنەوە و گوتی: ئەگەر دڵۆپە خوێنێکت بینی، خێرا وەرەوە لای خۆم!

دەترسم! گێژ بووم! تۆ پێتوایە من چیم؟ سندوقێک، پاکەتێک؟

من ژنێکم، مرۆڤم! ناتوانم جەرەکانی مێشکم شل و توونـد بکـەم و بـەر بـە کارکردنی بگـرم! نـاتوانم هێڵـی سـوور بـۆ هەسـتەکانم دیـاری بکـەم و لـە بەرامبەریاندا ڕاوەستم! ناتوانم لە بەرامبەر شادی و خەمدا بێ لایەن بـم! لـە بەرامبەر زۆر شتدا کاردانەوەم هەیە! سـەرم سـووڕ دەمێنـێ، نارەحـەت دەبـم ... تەنانـەت ئەگـەر خۆشـم بمهـەوێت نـاتوانم وەکـو مەکینەیـەکی بەرهـەم هێنانی مرۆڤم لێ بێت! تۆ چاوەڕوانیەکانت لە ئاستێکی باڵا دایـە! بچکۆلەکە! سـەرەتا جەسـتەمت داگیـر کـرد و ئـەوت لـە مافـە سـەرەتاییەکەی کـە ڕێگا ڕۆیشتن بێت، بێبەش کرد و ئێستاش دەتهەوێ دڵ و مێشک و ڕوحیشم لە گەڕ بخەی؟ ئەوانەت لاواز کردوە! توانای بیرکردنەوە و هەسـت کردنیشـت لێ زەوت کردووم! تەنانەت ویژدانی نائاگاشم بـە تاوانبـار دەزانـی! خـەریکی

زیاتر پێ لە بەرەی خۆت رادەکێشی و ئەوەش ئینساف نییە! بچکۆلەکە! ئەگەر دەتهەوێت بە یەکەوە بین! هێندێک مەرج هەن کە دەبێ قەبوڵیان بکەی! من کارێکت بۆ دەکەم: قەڵەو دەبم و جەستەم لە ئیختیاری تۆ دەنێم! بەڵام روحم هەر هی خۆمە! کاردانەوەکانم هی تۆ نین! ئەوان ناکەمە کۆیلەی تۆ! تۆ نابێ تەنانەت کارت بەو شتانەش بێت کە من حەزم لێیانە! ئێستا هەرچەندێک پێم خۆش بێت ویسکی دەخۆمەوە و جگەرە لە سەر جگەرە دادەگیرسێنم! سەر لە نوێ دەست دەکەمەوە بە کار کردن! لە شێوازی سندوق بوون دەردێم و سەر لەنوێ دەبمەوە بە مرۆڤ! مرۆڤێک کە هەر کاتێک حەزی لێ بێت و پێی خۆش بوو، دەگریت، دەگریت، دەگریت ... پرسیارت لێناکەم داخوا ئەم کارانەم نارەحەتت دەکەن یان نا؟ چونکە ئیتر بە راستی ماندووت کردووم!

***

بمبورە! رەنگە سەرخۆش بوبم یان لە کەللەی دابووم! سەیری قونچکە جگەرەکان بکە! سەیری ئەو دەسماڵە بکە! هێشتاش تەڕە! زۆر دیمەنێکی شێتانە و پیسە! لە خۆبایی ببوم! حاڵت چۆنە؟ بچکۆلەکە! هیوادارم لە من باشتر بی! سەبرم نەماوە! هیلاکم بەڵام دەمهەوێ شەش مانگی دیکەش خۆڕاگر بم و تۆم ببێ و دواتر بمرم! تۆ لەم جیهانەدا جێگاکەی من پڕ دەکەیتەوە و منیش هەتا هەتایە ئیسراحەت دەکەم! پێموایە کاتی مردنم هاتوە! پێموایە هەمووی ئەو شتانەی کە دەبوایە بیانبینم، بینیومن و ئەو شتانەش کە دەبوایە بیانزانم، فێریان بووم! کاتێک تۆ لە جەستەم بێیتە دەرێ، ئیتر پێویستت بە من نییە! هەر ژنێک کە خۆشی بوێ دەتوانێ

جێگای دایکت بگرێتەوە! ئەو هاوخوێنییە درۆیەکی گەورەیە! دایک ئەو کەسە نییە کە تۆ لە سکی خۆیدا ئەملا و لا پێدەکات، دایک ئەو کەسەیە کە گەورەت دەکات! دەتوانم وەکو دیارییەک پێشکەشت کەم بە باوکت! باوکت زوو گەڕایەوە و چەپکە گوڵێکی شینی بۆ هێنام! دەڵێن گوڵی شین هێمای کوڕ بوونە! ئێستا ئەو ئیتر تەنانەت بیر لە رەنگەکەشت دەکاتەوە و حەز دەکات کوڕ بی! کوڕ لە دایک بوون بە رای ئەو تایبەتمەندییەکی باشە! چەشنێک گەورەییە! ئەو چارەڕەشە خەتابار نییە! هەمیشە هەر ئەوانەیان بە گوێیدا خوێندوە کە خوا پیرە پیاوێکی ریش سپییە و مریەم هەر تەنیا منداڵەبەرێکی بێ بایەخ بوە و بە بێ یوسف تەنانەت نەیتوانیوە ئاخوڕێکیش بۆ شوێنی لە دایک بوونی مەسیح بدۆزێتەوە! تەنانەت لە ئەفسانەکانیشدا، پرومتە ئاگری هەڵکردوە! نامهەوێ بێحورمەتی بە باوکت بکەم بەڵام دڵنیام کە من و تۆ هیچ پێویستییەکمان پێی نییە! تەنانەت چەپکە گوڵە شینەکەشمان ناوێت! پێمگوت لە ماڵەکەمان بچێتە دەرێ و لێمان گەڕێت با ئاسودە بین!

دەتگوت بە کوتەک لە سەریان داوە، بێ ئەوەیکە هیچ قسەیەک بکات، لینگی تێک باڵدران و چۆ دەرێ و دەرگاکەشی پێوە دایەوە!

تاوێکی دیکە دەبێ من و تۆش بچینە سەر کار! بەرپرسەکەم بە تەلەفۆن پێی گوتم کە بارودۆخی من دەرک دەکات بەڵام منیش دەبێ رێز لە بەرپرسیارێتیەکانم بگرم! ژنی دووگیان کە سکی بوو بە شەش مانگانە نابێ بچێتەوە سەر کار! ئاماژەی بە سەفەرەکەش کرد و هەڕەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو کارە بە پیاوێک دەسپێرێت چونکە لانیکەم پیاوەکان لە

هێنـدێک بەسـەرهات لـە ئەمانـدان! دەمهەویسـت مسـتێکی لـە سـینگی دەم، بەڵام خـۆم کۆنترۆڵ کـرد! دە ڕۆژی دژوارمـان لـە پێشـە و دەبـێ قـەرەبووی کاتە بەفیڕۆ چوەکان بکەینەوە! با شتێکت پـێ بڵێم: سـەر لـە نـوێ چوونـەوە سـەر کارەکـەم دەبێتـە هـۆی ئەوەیکـە لـەو گێژییـە و لـە هەسـت بـە لاوازی کـردن لـە بەرامبـەر مەرگـدا کـە لـە ناخمـدا خـۆی حەشـار داوە، ڕزگـار بـم! خۆشبەختانە زستانە و سکە هەڵامساوەکە لـە ژێـر باڵتۆدا زۆر بـەرچاو نییـە! سکم هـەروا دێـت و گـەورەتر دەبێـت! کراسـەکەم بـە سکمەوە نوسابوو! لـە ماوەی چوارده حەوتوودا باڵاکـەت چەنـد سانتی مـەترە؟ نزیکـەی دە سانتی مـەتر! تـازە دەبـێ حیسـابێکیش بـۆ منداڵـدانم بکـەین! تـۆ زۆر بـێ بەزەییانـە هەموو ناخی منت داگیر کردوە!

***

من لەو کەسانە نیم کـە لـە خـوێن دەترسـن! ژن بـوون فێرگەیەکـە بـۆ ئاشـنا بوون لـە گـەڵ خـوێن! ئێمـە هـەر مانگـەی جارێـک لەگـەڵ دیمـەنی قیزەونـی خـوێن بـەرەوروو دەبـین! بـەڵام کاتێـک کـە ئـەو دڵۆپـە خوێنـەم لـە سـەر مەڵافەکـە بینـی، بـەرچاوم لێـڵ بـوون و ئـەژنۆم شـکان! سـەرەتا تـرس و دواتریش بێ هیوایی سەرتاپێی داگرتم و خۆم بە لەعنەت کرد! لە بەرامبـەر تۆدا خۆم بە تاوانبار دەزانی چونکە نەتدەتوانی بـەرگری لـە خـۆت بکـەی و توانای ڕاخوشینت نەبوو! تـۆ بـە بـێ پارێزەر یەخسیری گەمـە و کایـە و بـێ موبالاتیـەکانی مـن ببـوی! ئـەو دڵۆپـە تەنانـەت سـووریش نـەبوو، بـەڵکو پەمەییـەکی کـەمرەنگ بـوو! بـەڵام هـەر ئـەو دڵۆپـە پەمەییـەش دەیتـوانی پەیامەکـەی تـۆم پێبگەیـەنێت و تێمبگەیـەنێت کـە لەوانەیـە ژیانـت بـەرەو

کۆتایی بچێت! مەلافەکەم کۆ کردەوە و هەڵاتم! دوکتۆرەکە ئەمجارەیان میهرەبان بوو! خێرا هێشتی بچمە ژوورەوە و گوتی ئارام و لە سەرخۆ بم! تۆ لە منداڵدانەکەم هەڵنەکەنرابووی! لە حاڵی مردنیشدا نەبووی! تەنیا تۆزێک ئازارت پێ گەیشتبوو! ئیسراحەتێکی تەواو هەموو شتێکی دێنایەوە سەر جێی خۆی! هەڵبەتە دەبوایە زۆر بە پارێز بوومایە و تەنانەت بۆ کاری تواڵێتیش نەدەبوایە لە جێ بێمە دەرێ! بۆ ئیسراحەتێکی لەم چەشنە دەبوایە لە نەخۆشخانە بیانخستمایە! ئێستا ئێمە لە نەخۆشخانەین! لەم جیهانە خەمینەدا! حەوتوویەکی تەواوە من لێرە خەوتووم! هێورکەرەوەکان گێژیان کردووم! ئەمڕۆ هێورکەرەوەکانیان لێ بڕیوم بەڵام بارودۆخەکە نالەبارتر بوە! ئیتر نازانم ئەو کاتە زیادییەی کە ئەو دڵۆپە بێ بایەخانەی تێدا هەڵدەچۆڕێن، چۆن بە سەر بەرم! داوای رۆژنامەم کرد و بۆیان هێنام! تەلەفزیۆنم داوا کرد، بۆیان نەهێنام! داوای تەلەفۆنم کرد بەڵام ئامێرەکەی خراپ ببوو! نە دۆستەکەم دێتە ئێرە و نە باوکیشت! ئەو بێدەنگییە تێکم دەدات! یەخسیری گیانلەبەرێکی سپی پۆشم کە هەر چەند سەعات جارێک بە دەرزییەکەوە دێت و لەشم کون کون دەکات! ناتوانم وەکو جاران لەگەڵت میهرەبان بم! ئەو شتانەی کە ماوەیەک بوو هەر بە خەیاڵیشم دا نەدەهاتن و بەر لەوەی باڵ بگرن پەڕوپۆم لێدەکەنەوە، ئێستا هێرشیان کردۆتە سەر مێشکم و باسی شتی سەیر و سەمەرە دەکەن: بۆ دەبێ عەزابێکی لەم چەشنە تەحەمول بکەم؟ تەنیا لە بەر خاتری نووستن لەگەڵ پیاوێک؟ بۆ خانەیەک کە بە سەر دوو، چوار، هەشت و ... خانەی دیکەدا دابەش بوە بێ ئەوەیکە خۆم حەزم لە شتێکی وا بوبێت یان بڕیارێکی وام دابێت؟ یان لەوانەیە بۆ ژیان؟ باشە! بۆ ژیان! بەڵام ئەوە چ یاسایەکی

بێبەزەییانەیە کە بایەخی تۆی نەبوو، زۆر لە من کە دەژیم، زیاترە؟ ڕێز گرتن لە تۆ ڕێز لێنانی بۆ من نەهێشتۆتەوە! مافی تۆ چییە کە مافی منی پێ لە ناو ببەی؟ هەستی مرۆڤایەتی لە ناخی تۆدا نییە؟ مرۆڤایەتی! هەر بە ڕاست تۆ مرۆڤی؟ بە ڕاستی هێلکۆکەیەک و تۆوێکی ( ئێسپێرماتۆزۆئید) پێنج میکرۆنی دەتوانن مرۆڤێک دروست بکەن؟ مرۆڤ منم کە بیر دەکەمەوە و قسە دەکەم و پێدەکەنم و دەگریم و دەتوانم بەرهەمهێنەر بم! تۆ تەنیا بووکەڵەیەکی کە لە گۆشت بەرهەم هاتوە و هیچی تر! بووکەڵەیەک کە بیر ناکاتەوە، قسە ناکات، پێناکەنێ و ناگریت و تەنیا خەریکی سازان لەگەڵ خۆیەتی! ئەوەیکە لە تۆدا دەیبینمەوە، تۆ نی، بەڵکو ئەوە خۆمم!

ویژدانێکم بە تۆوە گرێداوە کە تۆ هیچی لەبارەیەوە نازانی! لەگەڵت دوام! بەڵام ویژدانی تۆ ویژدانی منە و گەپ لێدانی ئەم دووانەمان هەر گەپ لێدانێکی یەک کەسی بوە! گەپ لێدانی من لەگەڵ خۆم! ئەم هەڵیت و پڵیتە گاڵتەجاڕانەیە ئیتر بەسن! مرۆڤ بەر لە لەدایک بوونی هیچ مافێکی نییە و دوای ئەوەیکە لەدایک بوو، دەبێتە مرۆڤ! ئەویش لە بەر ئەوەیکە لەگەڵ مرۆڤەکانی تر تێکەڵاوە! ئەو مرۆڤانەی کە یاریدەدەری دەبن! ژنێک یان پیاوێک بە ڕێگادا ڕۆیشتن و خواردن و قسەکردن و بیرکردنەوە و شتە باوەکانی دیکەی مرۆڤایەتی فێر دەکات!

خۆشەویستەکەم! تەنیا شتێک کە من و تۆی پێکەوە گرێداوە، ناوکێکی پڕ و پوچە! من و تۆ جووتێک نین! بچکۆلەکە! یەکێکمان زاڵم و یەکێکمان چەوساوەیە! تۆ زاڵمی و من چەوساوەم! وەکو زەروو بە لەشمەوە نوساوی و

خوێن و هەناسە هەڵدەمژی! ئێستاش دەتهەوێ بە تەواوی خۆم فیدای تۆ بکەم، بەڵام من ئەو مەجالەت نادەمێ! ئێستا کە ئەوانەت بیست دوایین قسەشم ئەوەیە کە: هیچ پێویستییەکم بەوە نییە کە منداڵم ببێت! من هیچکات لە گەڵ منداڵان بەینم خۆش نەبوە و لە گەڵیان نەسازاوم! تەنانەت کاتێک بە بزەوە لێیان نزیک دەبمەوە، وەها دەگرین کە دەڵێی دێوەزمەیان دیوە! دایکایەتی کاری من نییە! من ئەرکی دیکەم لە سەر شانە! حەزم لە کارەکەمە و دەمهەوێ درێژەی پێبدەم! داهاتوو چاوەڕێم دەکات و بە خەیاڵیشمدا نەهاتوە وازی لێ بێنم! ئەوانەی لە ژنێکی هەژار کە نایهەوێ منداڵێکی دیکەی ببێ، خۆش دەبن، لە منیش خۆش دەبن! ئەوانەی کە لە کچێک کە دەستدرێژی کراوەتە سەر دەبوورن، لە بەر ئەوەی کە میوەی ئەو گوناهەی ناوێت، لە منیش دەبوورن! تەنیا هەژاری و کەوتنە بەر دەستدرێژی هۆکارێکی باشی ئەم کارە نییە! لەم نەخۆشخانە بە لەعنەت کراوە هەڵدێم و دەچمە سەفەر! هەرچییەک دەبێ با ببێت! ئەگەر توانیت ئەوە لە دایک دەبی و ئەگەریش نەتتوانی، ئەوە دەمری! من ناتکوژم و تەنیا لە یارمەتیدان و پەسندکردنی یاسا زۆرە ملەکانت خۆم دەبوێرم ...
لە بیرت نەچێ کە قەول و قەراری وامان نەبوو! هەر قەرار و بەڵێنێک، ڕێککەوتننامەیەکە کە لەودا هەر کام لە لایەنەکان شتێک بە بەرامبەرەکەی دەبەخشێت! کاتێک من ئەو بەڵێنەم واژۆ دەکرد، نەمدەزانی کە تۆ هەموو شتێکت دەوێ و لە بەرامبەریشدا هیچم نادەیتێ! تەنیا من بە شێوەیەکی یەک لایەنە ئەو ڕێککەوتننامەیەم واژۆ کردوە و هەر ئەوەش بەڵێنەکەیان بێ بایەخ دەکات! تۆ نە ڕێککەوتننامەت واژۆ کردوە و نە پەیامێکیشت بۆ ناردووم! تەنیا پەیامێک کە لە لایەن تۆوە پێم گەیشت، هەر دڵۆپە

پەمەیيەکانی خوێن بوون! بە لەعنەت بم ئەگەر جارێکی دیکە لە قسەی خۆم پاشگەز ببمەوە ... تەنانەت ئەگەر ئەو بڕیارە ببێتە هۆی پەژیوانی و عەزابێکی تەواویش!

***

دوکتۆرەکە گوتی من کەسێکی قاتڵم! لە جلوبەرگە سپییەکانیدا ئیتر حاکمێک بوو نەک دوکتۆرێک! بە منی گوت کە وەکو شارۆمەندێک ئەرکی سەرەکی سەرشانم بە جێ نەهێناوە! هاواری کرد کە دەبێ لە نەخۆشخانە بمێنمەوە و کاری قورس نەکەم، جا چ بگات بەوەی کە بچمە سەفەر! گوتی یاسا لە بەرامبەر قاتڵەکاندا چۆنە، دەبێ بۆ منیش ئاوا بێت! دواتر هێورتر بۆوە و ویستی بە پیشاندانی وێنەکانت، لە سەفەرەکەم پەژیوانم بکاتەوە! ئەگەر تۆزێک هەستم هەبوایە تۆم دەبینی! ئیتر منداڵێکی تەواو و کامڵ بووی! دەمت ببوو بە دەم نەک چاڵێک یان قوڵاییەک! لوتت، لوتێکی راستەقینە و دەموچاوت وەکو هی مرۆڤی لێهاتبوو! جەستەت شێوازێکی راستەقینەی بە خۆیەوە گرتبوو! دەستەکان و قاچەکانت و تەنانەت نینۆکەکانیشت دەبیندران! چەند تاڵ موو بە سەرتەوە دیار بوو! لە پێستەکەت رامابووم! پێستەکەت هێندە ناسک بوو ک مووڕەگ و عەسەبەکانی تێڕا دیار بوون!

تۆ ئیتر گەورە بووی! شازدە سانتی مەتر باڵا و دوو سەد گرەم کێشەکەتە! ئەگەر بمهەویستبایە لەبارت بەرم، دەبوایە زووتر دەست بەکار بوومایە! ئێستا ئیتر درەنگە! بەڵام من خۆم بۆ زۆر شتی خراپتر لە لەبار بردنی کۆرپەکەش ئامادە کردبوو! بێ ئەوەی پێڵوەکانم لە سەریەک دانێم، گوێم لە

هەموو قسەکانی دوکتۆرەکە راگرت! دواتر کاغەزێکی دامێ بۆ ئەوەی ئیمزای بکەم! لە کاغەزەکەدا نووسیبووی کە ئیتر ئەو هیچ بەرپرسیارێتییەکی لە مەڕ ژیانی من و تۆ لە ئەستۆ نییە! بە ئیمزا کردنی ئەو کاغەزە بەرپرسیارێتی هەردووکمان کەوتە سەر شانی خۆم! دوکتۆرەکە کە سوور هەڵگەڕابوو و تووڕە بوو، چوە دەرێ! هەر ئەو کاتە تۆ جوڵەیەکت کرد! جووڵەی تۆ ئەو شتە بوو کە ماوەیەکی زۆربوو چاوەڕوانی بووم و تۆ ئاگادارت کردمەوە!

نازانم دەست و پێت دەجوڵاندن یان باوێشکت لێدا، بەڵام پێ لەقەیەکت بە سکم دادا کە زۆر پڕ مانا بوو! یەکەمین پێ لەقەت بوو! هەر وەکو ئەو پێ لەقەیە بوو کە من بە سکی دایکمم دادا و تێمگەیاند کە نابێ لە بارم بەرێت! قاچەکانم وەکو بەرد رەق ببوون! بۆ چەند ساتێک نەمدەتوانی هەناسە بدەم و سەرم گەرم داهاتبوو! گەرووم دەسووتایەوە! چاوم پڕبوون لە فرمێسک! راشکاوانە لە سەر گۆناکانم هەڵخلیسکان و کەوتنە سەر مەلافەکە! بەڵام بەو حاڵەشەوە لە قەرەوێڵەکەم هاتمە خوارێ و جانتاکەم داخست!

سبەینێ بە تەیارە دەڕۆم!

***

رەنگە لە خۆڕا خۆمانمان نارەحەت کردبوو! ئێستا لەو وڵاتەی کە سەفەرمان بۆی کردوە، بارودۆخمان باشترە! لە کاتی سەفەردا و دوای ئەویش هیچ شتێک نارەحەتی نەکردین! تەنانەت بۆ یەک جاریش نە ئێشم بوو و نە

دڵیشم تێکەڵ هات! قسەکانی دوکتۆرەکە هەموویان هەر هیچ بوون و هیچیش رووی نەدا! ئەو خانم دوکتۆرەی کە دوێنێ پشکنینی بۆ کردم، هاوڕای من بوو! تۆزێک دەستی بە سکم داهێنا و گوتی کە دوکتۆرەکەی پێشووت زۆر هەستیار بوە! ئەی دڵۆپە خوێنەکە چی؟ دەیگوت هێندێک لە ژنەکان لەکاتی دووگیانیدا چاویان بە خوێن دەکەوێت، بەڵام منداڵەکەیان ساغە! دەیگوت ژنی دووگیان نابێ هەر بە تەنیا ئیسراحەت بکات و ئەو کارە چەشنێک زێدەڕۆی و کاڵفامانەیە! بۆ وێنە یەکێک لە نەخۆشەکانی ئەو رەقاسە (Ballerine) بوە و هەتا کۆرپەکەشی پێنج مانگەی پڕ کردەوە هەر خەریکی راهێنان بوە و هیچ گرفتێکیش بۆ خۆی و منداڵەکەی نەهاتۆتە پێشەوە! گوتی هەر ئەو دەوایانەی کە دوکتۆرەکەی پێشوو بۆی نوسیبوم، بە کار بێنم و خەریکی کاری ئاسایی و رۆژانەی خۆم بم! تەنیا تێبینییەکی هەبوو ئەویش ئەوە بوو کە باشتر وایە زۆر ئۆتۆمبێل لێ نەخورم! پێمگوت کە چەند رۆژی دیکە دەبێ بە ئۆتۆمبێل سەفەرێکی دەرۆژە بکەم! برۆکانی هەڵتەکاند و پرسی، هەر دەبێ بچی بۆ ئەو سەفەرە؟ منیش وەڵامی ئەرێم دایەوە! تۆزێک بێدەنگ بوو و دواتر گوتی قەیدێ ناکات چونکە جادەکانی ئەم وڵاتە زۆریان هەڵبەز و دابەز نییە و ئۆتۆمبێلەکانیشی نەرمن! تەنیا دەبێ ئاگام لە خۆم بێت زۆر گوشارم بۆ نەیەت و هەر بە دوو سەعات جارێک دەبێ پشوو بدەم! گوێت لێیە چیت پێدەڵێم؟ دەڵێم لە گەڵت ئاشتبوومەوە و هەر وەکو رابردوو پێکەوە دۆستین! بۆ کارە خراپەکانی رابردووم داوای لێبوردنم هەیە! ئەگەر نارەحەت بی و پێ لەقە بە سکم دانەدەی زۆر خەمگین دەبم! لەو کاتەوە کە لای دوکتۆرەکەی دیکەوە هاتوین پێ لەقەت نەهاویشتوە! هێندێک جار بیر لەو شتە دەکەمەوە و نێو

چاوانم گرژ دەبێ، بەڵام زۆر زوو دێمەوە سەر خۆم و هێور دەبمەوە! تێگەیشتی چەندە گۆڕاوم؟ لە کاتێکەوە کە چوومەوە سەر کار، هەست دەکەم مرۆڤێکی دیکەم! وەکو پەڕەسێلکەیەک کە تازە فێری باڵەفڕە دەبێ! بە راستی مەرگم بە ئاوات دەخواست؟ گێژ ببووم؟ ژیان و رووناکی زۆر جوانن! درەختەکان و زەوی و دەریاش جوانن! لێرە دەریای زۆر لێن! هەست بە بۆنی دەریا دەکەی؟

کاتێک مرۆڤ خۆشحاڵە کارکردن زۆر خۆشە! بە درۆ گوتم کە کارکردن مرۆڤ سوک و هیلاک دەکات! بمبورە! هێندە گێژ ببووم بۆیە هەموو شتێک لە بەر چاوم رەش دەینواند! دەمهەوێ زۆر زوو تۆ لەو تاریکاییە بێنمە دەرێ! هەر بۆیە بێ تاقەتم! لەوانەیە بەمکارە بتوانم ئەو خەم و خەفەتە لە سەر دڵت لابەرم کە بە باسکردن لە نەبوونی ئازادیی لە جیهاندا، خستبومە سەر دڵت! ئەو قسە پڕوپوچانە لە بیر خۆت بەرەوە! پێکەوە بوون زۆر باشە! لە ژیانێکی کۆمەڵایەتیدا دەبێ دەست بخەینە نێو دەستی یەکتری و یارمەتی یەکتری بدەین!

گیاکان کاتێک کە لە دەوری یەکترن، زیاتر گوڵ دەردەکەن، باڵندەکان بە کۆمەڵ دەفڕن و ماسیەکانیش بە کۆمەڵ مەلە دەکەن! ئێمە بە تەنیا چیمان لە دەست دێت؟ وەکو ئەو کەسانەمان لێدێت کە دەچنە سەر مانگ و لە ترسان و لە تاوی گەڕانەوە هەست دەکەن دەپیشێن!

خێراکە! ئەو چەند مانگەی کە ماوتە هەتا لە دایک ببی زوو تێپەڕی بکە! بە بێ ترس لە بینینی خۆرەتاو وەرەدەرێ! سەرەتا شۆقەکەی چاوت ئازار دەدات و دەبێتە هۆی ترس و سەر سووڕمانت، بەڵام زۆر زوو لەگەڵی

رادێی و هێنده خۆشت دەوێ کە ناتوانی بە بێی بژی! لەوەیکە هەمیشە نمونەی ناشیرین و مەترسیدارم بۆ هێناویتەوە، داوای لێبوردنت لێدەکەم! دەمتوانی بۆت باسی جوانیی خۆرهەڵات و تامی خۆشی ماچ و بۆنی خۆشی خۆراک بکەم! پەژیوانم لەوەیکە هەتا ئێستا نەمتوانیوە کارێک بکەم کە پێبکەنی! ئەگەر لە رووی ئەو شتانەوە کە بۆم باس کردووی، هەڵمسەنگێنی، هەست دەکەی کە من سیحربازێکی رەشپۆشم! لەمەو بەدوا دەبێ ئەمن وەکو پیترپان کە هەمیشە بە جلە زەرد و سەوز و سوورەکانیەوە بە سەر سەربانەکان و ناقوسەکان و هەورەکاندا گوڵ دەبارێنن، وێنا بکەی! من و تۆ لای یەکتری بەختەوەر دەبین، چونکە راستییەکەی بۆ خۆشم هەر منداڵم! نازانی چەندە حەزم لە یاری کردنە! دوێنێ شەو کاتێک هاتمە میوانخانەکە، ئەو پێڵاوانەی کە بۆ بۆیاخکردن دایاننابوون، جێگای هەموویانم گۆڕی و ژێتۆنەکانی نانی بەیانیشم هەر هەموو بە یەکەوە گۆڕین! ئەم بەیانییە چ قیژ و قاوێک دروست ببوو! ئەو ژنەی کە جووتێک پێڵاوی پیاوانەی بە دەستەوە بوو، بە شوێن پێڵاوی پاشنە بەرزدا دەگەڕا، ئەو پیاوەی کە پێڵاوی وەرزشی لە بەر دەرگای ژوورەکەی بوو، بە شوێن چەکمەکانیدا دەگەڕا و کەسێک هاواری دەکرد کە لە جیاتی هێلکە و رۆنێک و ژامبۆنێک تەنیا چایەکی تاڵیان بۆی بردوە! یەکێکی دیکە دەیگوت تەنیا داوای چایەکی تاڵی کردوە بەڵام نان و چای سەرلەبەیانی رۆژی جەژنی نوئێلیان بۆی بردوە! گوێم بە دەرگاکەوە نابوو و وەها لە ناخی دڵمەوە پێدەکەنیم کە دەتگوت گەڕاومەتەوە بۆ رۆژانی خۆشی سەردەمی منداڵیم! ئەو رۆژانەی کە هەر کارێک بۆ من چەشنێک کایە کردن بوو و زۆر بەختەوەر بووم!

***

بێشکەیەکم بۆ کڕیوی! دوای کڕینەکەی وەبیرم هاتەوە کە هێندێک کەس پێیانوایە کڕینی بێشکە بەر لە لەدایک بوونی منداڵ وەکو دانانی گوڵ لە سەر قەرەوێڵە مەیمەنەتی باش نییە! بەڵام من باوەڕم بە خوڕافات نییە! ئەوەی کە کڕیومە شتێکە لە چەشنی بێشکەی سوور پێستەکان! دەتوانی منداڵەکە بخەیتە ناوی و لە پشتی خۆتی قایم بکەی! ڕەنگەکەی وەکو جلی پیترپان زەرد و سەوز و سوورە! تۆ دەخەمە سەر شانەکانم و لە گەڵ خۆم بۆ هەموو شوێنێکت دەبەم!

خەڵکی پێمان پێدەکەنن و دەڵێن: سەیری ئەو دوو منداڵە شێتە بکە!

جلیشم بۆ کڕیوی! جلی ژێرەوە، جلی سەرتاپا، یەک دانە سندوقی مۆسیقاشم بۆ کڕیوی کاتێک قورمیشی دەکەی مۆسیقایەکی شاد (Valse) لێدەدات! کاتێک لە گەڵ دۆستەکەم باسی شت کڕینەکەم کرد، گوتی مرۆڤێکی ئاسایی نیم! بەڵام خۆشحاڵی لە دەنگیدا دیار بوو و نیگەرانیی بەر لە چوونم بۆ سەفەرەکەی بە روخسارەوە دیار نەمابوو! دایمە دەیگوت:

ـ نەکا لە کاتی هەستانی فڕۆکەکەدا منداڵەکە شتێکی لێ بێت؟

ئەوە هەر ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەیهەویست لە ناوت بەرم! ژنێکی میهرەبانە! من هیچکات سەبارەت بەو ڕۆژەی کە باوکتی ناردبوو بۆ ماڵێ سەرکۆنەم نەکرد! دەزانی لە بارەی باوکتەوە چۆن بیر دەکەمەوە؟ هەر وەک من کە چۆن باوکتم دەرکرد، ئەگەر پیاوێک ئیزن بدات کە دەری بکەن دیارە مرۆڤێکی بەکەڵکە! دواتر لە نامەیەکدا بۆی نوسیم کە هەستی بەوە کردوە کە پیاوێکی بێ عورزەیە! بەڵام هەر بۆ ئەو پیاو نەبوونە دەبێ

لێی ببووری! به رای من چەشنێک غەریزە ( وارسکە) ئێستا ئەو بۆ لای تۆ ڕادەکێشێت! دواتر بیرێکی لێدەکەینەوە! وەکو قەنەفەیەکە کە هیچ نییە بەڵام بە کەڵکی شتێک هەر دێت! دڵنیایە کە من دوژمنی ئەو نیم! لەو ئاشتیەدا هەموو پێکەوە بەشدارن: ئەو، دوکتۆرەکان، بەرپرسەکەم ... نازانی کاتێک بە بەرپرسەکەم گوت کە دەچمە سەفەر، چەندەی پێ خۆش بوو! خێراخێرا دەیگوت:

ـ هەواڵێکی خۆشە! ئافەرین! دڵنیابە لەو سەفەرەت پەژیوان نابیتەوە!

پەژیوان نابمەوە! مرۆڤ تا کاتێک بەڕێزە کە ڕێز لەکەسانی دیکە بگرێت! باوەڕ بەخۆبوون دەبێتە هۆی ئەوەیکە کەسانی دیکەش باوەڕیان پێی هەبێت! حەز دەکەم شیعرێکت بۆ بنوسم کە لەودا باسی ئارامی و متمانە و گوڵباران کردنی سەربانەکان و ناقوسی کڵێسەکان و هەورەکان و هەستی پەڕەسێلکەیەک بکەم! بێ خەم و خەفەت، لە سەر دەریایەک کە لەو سەرەوەڕا هەمیشە خاوێنە ... ڕاستیەکە ئەوەیە کە: بوێری دەستەخوشکی گەشبینییە! من گەشبین نەبووم، چونکە بوێر نەبووم!

***

جادەکانی ئەم مەملەکەتە ساف و بێ کەند و لەندن و ئۆتۆمبێلەکانیشی نەرم و ئاسودەن ... تۆ کڵاوت دەنایە سەر خۆت! دوکتۆرگیان من پەڕەسێلکە نیم! دەڵێی چی بکەم؟ بچکۆلەکە! بەرەو پێش بچم یان بەرەو دواوە بگەڕێمەوە؟ ئەگەر بۆ دواوە بگەڕێمەوە بارودۆخەکە نالەبارترە چونکە سەر لە نوێ دەبێ بەو ڕێگا پڕ کەند و لەندەی کە پێیدا هاتووم، بگەڕێمەوە،

بەڵام ئەگەر بەرەو پێش بچم، لانیکەم هیوادارم جادەکە باشتر بێت! ئەگەر بوێرم راستییەکەشت پێ بڵێم، لە جادەیەکداین کە رێک وەکو ژیانی من پڕپڕە لە کەندوکۆسپ!

جارێکیان نوسەرێک دەیگوت: هەموو کەس شیاوی ئەو ژیانەیە کە هەیەتی! یانی هەژار دەبێ هەژار بێت و کوێریش دەبێ هەر کوێر بێت! زیرەک بوو بەڵام زۆر نەفام بوو! سنووری نێوان زیرەکی و نەفامی جاری وایە هێندە ناسکە کە بەرچاو ناکەوێت! هەر بۆیە چ پیاو بی و چ ژن بی، کاتێک کە هیچ سنوورێک لە نێواندا نەبێت، ئەوا ئەم دوو شتە تێکەڵاو دەبن! وەکو عەشق و بێزاریی، ژیان و مەرگ ... دیسانەوە دەمهەوێ بزانم تۆ کچی یان کوڕ؟ ئێستا حەز دەکەم کوڕ بی! لانیکەم مانگە و مانگ چاوت بە خوێن ناکەوێت و لە لێ خوڕینی ئۆتۆمبێل لە جادەی پڕ کەند و کۆسپدا هیلاک نابی! ئەگەر کوڕ بی هیچکات حاڵێکی ناخۆشی وەک ئێستای منت نییە و دەتوانی زیاتر لە من بە ئاسمانەکاندا بفڕی! حەزم لە فڕینە، بەڵام تەنیا هەڵبەزین و دابەزینم تەجرەبە کرد! ژنان مافی خۆیانە کە سینەپۆش (کورسێت)ەکانیان ئاگر تێبەردەن! بە تەواوی ئەوە مافی خۆیانە! هیچکامێکیان نەیانتوانیوە رێگایەک بدۆزنەوە کە منداڵیان نەبێت و بە منداڵبونیشیان دونیا خراپ نەبێت! تەنیا ژن دەتوانێ منداڵی ببێت!

من سەبارەت بەو هەسارەیەی کە لەودا بۆ منداڵبوون حەوت کەس پێویست بوو، چیرۆکێکی خەیاڵیم خوێندەوە! بەڵام دۆزینەوەی ئەو حەوت کەسە و ئاشتی لە نێوانیاندا زۆر دژوار بوو، چونکە بێجگە لە دروست کردنی

تۆو (نوتفـە)، کاری دووگیـانیش لـە ئەسـتۆی هـەر حـەوت کەسـەکەیان بـوو! هەر بۆیە نەوەی دانیشتوانی ئەو هەسارەیە لە ناو چوون و چۆڵ و هۆڵ بوە!

چیرۆکێکی ترم خوێندەوە کە قارەمانەکەی شوشەیەکی ئاوێتە لە ئاو و خوێ دەخواردەوە و لە ناکاو دەتەقیـەوە و دەبـوو بـە دوو کـەس! خانـەکان دەبوونـە دوو بەشەوە و قارەمانی چیرۆکەکە ئیتر لەمەوبەدوا کەسێکی دیکە بوو! یانی ئـەو قارەمانـە خـۆی دەکوشـت! بـەڵام نـەدەمرد و نـۆ مـانگیش عـەزابی نـەدەکێشـا! نـۆ مانـگ عـەزاب؟ هێنـدێک کـەس شـانازیی بـەو نـۆ مانگـەوە دەکەن! باشترین ڕێگا هەر ئەوەیە کە پێشووتر پێمگوتی: باشـتر وابـوو تۆیـان لـە سکی مـن بێنایـە دەرەوە و بیانخسـتایە سکی ژنێکی دیکـەوە کـە لـە مـن میهرەبانتر و لە سەرخۆتر بوایە! پێموایە "تا"م لێهاتوە، "یاوم هەیـە"! بـەردەوام شـتێک لـە سـەر دڵـم کـۆ دەبێتـەوە بـەڵام دەبـێ گـوێی نـەدەمێ! ئـاخر بـە چ شـێوەیەک؟ دەبـێ بیـر لـە شـتی دیکـە بکەمـەوە! چیرۆکێکـی دیکـەت بـۆ دەگێڕمەوە! چونکە زۆر لەمێژە چیرۆکم بۆ نەگێڕاویتەوە! ئەوەش چیرۆکەکە:

ڕۆژێـک بـوو، ڕۆژێـک نـەبوو، ژنێـک بـوو کـە ئاواتـەخواز بـوو ببێتـە خـاوەنی لەتێک لە مانگ! ئاواتەکەی لەو سەردەمەدا شتێکی سەیر و سـەمەرە نـەبوو، ئەو زۆر کەسی دەناسین کە دەچوونە سەر مانگ! لە سەردەمی ئەودا چوونە سەر مانگ ببوە کارێکی باو! مرۆڤەکان لە هەموو شوێنێکی جیهانەوە سواری ئەو کەشتییە ئاسنینانە دەبوون کە بە موشەکێک هەڵدەگیران! هـەر جارێـک کـە ئـەو موشـەکە بـە دەنگێکی وەکـو دەنگی هـەورە تریشـقە بـەرەو ئاسـمان دەچوو، لە دوای خۆی جێ شوێنێکی وەکو جێ شوێنی ئەستێرە کلکدارەکان

بـە جێدەهێشـت، ئـەو ژنـە خۆشـحاڵ دەبـوو و روو لـە موشـەکەکە هـاواری دەکری:

ـ برۆ! برۆ! برۆ بۆ ئەوێ!

دواتـر ئیرەیـی بـە سـەفەری ئـەو مرۆڤانـە دەبـرد کـە سـێ رۆژ و شـەوی دەخایانـد! ئەوانـەی کـە دەچوونـە سـەر مانـگ کەسـانێکی گێـژ بـوون! دەموچاویان وەکو سەگ وابوو و گریان و پێکەنینیان نەدەزانی! چوونە سەر مانگ بۆ ئەوان تەنیا سەفەرێکی زانستی بوو و شانازییەک بوو بۆ زانستی سـەردەم! لـە کـاتی سـەفەر کردنـدا قسـەی باشـیان نـەدەکرد، تـەنیا باسـی هێندێک رەقەم و حیساباتیان دەکرد و تەنیا قسەیەکی نازانستی کە بە سەر زاریاندا دەهات، پرسیار کردن سەبارەت بە ئاکامی یاریی فلان تیپ بوو! کاتێکیش دەچوونە سەر مانگ ئیتر هیچ قسەیەکیان پێ نەبوو و تەنیا چەند رستەی ئاساییان بە کار دەهێنا! ئەو کات ئالایەکی ئاسنینیان هەڵدەدا و وەکو بووکەڵەی قورمیش کراو لە سەر مانگ پیاسەیان دەکرد! دوای ئەوە کە بە زبڵەکانیان مانگیان پیس دەکرد، دەگەڕانەوە و زبڵەکانیان لە سەر مانگ بە جێدەهێشت بۆ ئەوەی ئاماژەیەک بێت بۆ بوونی مرۆڤ لەو شوێنە! زبڵەکانیان لە سندووقی ئاسنین دا دادەنا و هەر لە تەنیشت هەمان ئالا بەجێیان دەهێشت! ئەگەر ئەوانە بزانی هەر کە لە مانگت روانی دەڵێی: ئەو سەرەوە پڕپڕە لە زبڵ! دواتریش بە کیسەی پڕ لە خاک و خۆڵەوە دەگەڕانەوە سەر زەوی! خاک و خۆڵی مانگ! هەر ئەو خاکەی ژنەکە بە ئاواتییەوە بوو! کاتێک ئەو ژنە چاوی بەو کەسانە دەکەوت کە سەفەری

مانگیان دەکرد، لێیان دەپاڕایەوە ... یانی دەپاڕامەوە و دەمگوت تۆزێک لە مانگیش بدەن بە من!

بەڵام ئەوان هەمیشە دەیانگوت:

ـ نابێ ئیزنمان لە سەر نییە!

هەموو شتێک لە سەر مێزەکان و لە تاقیگای ئەو کەسانەدا بوو کە مانگ بۆ ئەوان تەنیا شتێکی زانستی بوو و هیچی دیکە! ئەوان مرۆڤێکی نەفام بوون چوونکە روحیان نەبوو! سەرەڕای هەمووی ئەمانەش لە نێو ئەو پیاوانەدا ( پیاوانی بۆشایی ئاسمان)، یەکێک لەوانی دیکە باشتر دەهاتە بەرچاو چونکە گریان و پێکەنینی دەزانی! پیاوێکی وردیلانە بوو کە ددانەکانی گێڕ ببوون و زۆریش دەترسا! بۆ شاردنەوەی ترسەکەی دایمە پێدەکەنی و کڵاوە سەیرەکەی لە سەر دەنا و بە قسەی خۆی تۆزێک خۆی رێک و پێک دەکرد! هەر لە بەر ئەو شتانە و لە بەر ئەوەیکە بۆخۆشی دەیزانی کە شیاوی ئەوە نییە بچێتە سەرمانگ، لەگەڵی بووم بە دۆست! کاتێک چاوی بە من دەکەوت، بەردەوام دەیگوت:

ـ لەو سەرەوە باسی چی بکەم؟ خۆ من شاعیر نیم و ناتوانم رستەی جوان هەڵبەستم!

چەند رۆژ بەر لە رۆیشتن بۆ سەر مانگ بۆ ماڵئاوایی هاتە لام و دەیهەویست پرسیارم لێبکات کە لە وێ باسی چی بکات؟ گوتم دەبێ قسەیەکی راست بکات، بۆ وێنە:

ـ من دەترسم، چونکە پیاوێکی چکۆڵەم!

ئەو رستەیەی زۆر بە دڵ بوو و سوێندی خوارد و گوتی:

ـ کاتێک کە گەڕامەوە تۆزێک لە خاک و خۆڵی مانگت بۆ بە دیاری دێنم!

چوو و هاتەوە بەڵام بە تەواوی گۆڕابوو! هەموو جارێک کە تەلەفۆنم بۆی دەکرد بۆ ئەوەی وەبیری بێنمەوە کە چ بەڵێنێکی پێدابووم، هەر خۆی لێ دەشاردمەوە! شەوێکیان بۆ نانخواردنی ئێوارە دەعوەتی کردم بچمە ماڵەکەیان! منیش خێرا چووم چونکە پێموابوو دەیهەوێ (خاک و خۆڵی) مانگم بە دیاری بداتێ! لە سەر مێزەکە هێندە ئەولاقەولاقم کرد هەتا نانخواردنەکە تەواو بوو! دوای ئەوەی خواردنەکە تەواو بوو گوتی:

ـ ئێستا مانگت پیشان دەدەم!

نەیگوت ئێستا مانگت دەدەمێ بەڵام من زۆر هۆشم بە لای قسەکەیەوە نەبوو! هێشتاش هەر ئەو کڵاوە گاڵتەجاڕانەیەی لە سەر دەکرد و هەر وەکو پێشوو پێدەکەنی و منیش نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە لە بۆشایی ئاسماندا ئەو تۆزە روحەش کە بووی، نەیماوە!

بە چاو ئاماژەی پێکردم و پێکەوە چووینە ژووری کارەکەی! زۆر لە سەر خۆ دەتگوت خەریکی کایە کردنە، دەرگای دۆڵابەکەی کردەوە! لە دۆڵابەکەدا زۆر شتی تێدابوو! پاچ، خاکەناز (بێڵ)، بۆری ... تۆزێکی زێوینیش لە سەر هەموویان نیشتبوو! خاک و خۆڵی مانگ بوو!

ترپەی دڵم دەهات! دەستم برد و بێڵەکەم هەڵگرت! ئیتر ترپەی دڵم بە تەواوی بەرز ببۆوە! بێڵێکی سووک بوو! دەتگوت هەر کێشی لەبەر نییە! ئەو خۆڵەی کە لە سەری نیشتبوو وەکو ئاردی برنج نەرم بوو! کاتێک بە پێستی کەسێکەوە دەنوسا، وەکو ئەوە وابوو کە پێستێکی زێوین بە سەر تەواوی جەستەت دا کێشرابێ! ناتوانم ئەو هەستەمت بۆ باس بکەم کە بە بینینی خاک و خۆڵی مانگ لە سەر جەستەم، لە مندا پێک هاتبوو! وەکو ئەوە وابوو کە بە تەواوی بۆشایی ئاسماندا بڵاو بووبمەوە! دەتگوت دەستم بە شتێکی لەکران نەهاتووی هەتا هەتایی راگەیشتوە! ئێستا خەریکە بیر لەو شتانە دەکەمەوە چونکە ئەو کات توانای بیرکردنەوەم نەبوو! ئێستاش کە هێندە خۆم دێنم و دەبەم و گوشار دەخەمە سەر مێشکم هەتا ئەوانەت بۆ بگێڕمەوە، ناتوانم پێت بڵێم کە کاتێک بێڵەکەم بە دەستەوە گرت، چەند دەقیقە هەروا حەپەسام! هەر هۆشم لە خۆم نەبوو و نەمزانی کە ئەو وردە وردە دەترسێ لەوەیکە شتی ناو ئەو دۆڵابەی لێ بدزم کە ئامادە نییە کلیلەکەی بدات بە هیچکەس! کاتێک هەستم بە روانینی کرد بێڵەکەم دایەوە و گوتم:

ـ سوپاس! ئێستا مانگم بدەیە!

سەروچاوی هەڵقرچاو و گوتی:

ـ کامە مانگ؟

ـ هەر ئەو خاک و خۆڵەی مانگ کە بەڵێنەکەیت دابوو!

ـ هەر ئێستا دام بە تۆ! ئەوە نییە هێشتم ئەو بێڵە بە دەستەوە بگری!

پێموابوو رادەبوێرێ! چەند دەقیقەی پێ چوو هەتا زانیم بە راستی وا دەڵێت و پێیوایە چونکە هێشتویەتی دەست لە بێڵەکە بدەم، هەموو مانگی بە دیاری داوەمەتێ!

وەبیر ئەو سواڵکەرانە کەوتمەوە کە تەنیا دەتوانن لەو دیوی شوشەی زەرنگەرەکانەوە چاو لە زێڕەکان بکەن و لە دوورەوەڕا لەو جەژنە جوانانە بڕوانن کە ئیزنی بەشداریکردنیان نییە! هێندە گێژ و نارەحەت بووم کە توانای گاڵتە کردن بە کڵاوەکەیشیم نەبوو! تەنیا لە بەر خۆمەوە گوتم: خۆزگە بمتوانیبایە تێیبگەیەنم کە چەندە مرۆڤێکی هیچ و پوچە! بەو هیوا نەفامانەیەوە دەستم کرد بە پاڕانەوە و پێم گوت کە من لەتێکی مانگم ناوێت، تەنیا تۆزێکم خۆڵ بەسە! لە دۆڵابەکەدا تەپ و تۆزێکی زۆری تێدا بوو! هەر ئەوەندە بەس بوو ئیزنی بدایە تۆزێک لەو خاک و خۆڵە بۆ خۆم بکەمە نێو کاغەزێکەوە و هەڵیگرم! ئەو تۆزەی کە لە سەر پێستی دەستم نیشتبوو بەس نەبوو و دەمهەویست تۆزێک لەو خاک و خۆڵە لە نێو کاغەزەکەدا بۆ خۆم هەڵگرم بۆ ئەوەی هەر کاتێک پێم خۆش بوو، لێی بڕوانم و بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ لای خۆم هەڵیگرم! ئەو دەیزانی کە ماوەیەکی زۆرە ئەو خۆزگەیەم لە سەر دایە و لە ناکاو بە سەرمدا نەهاتوە! بەڵام بە هەر رادەیەک کە خۆم لە پێش چاوی چکۆلەتر دەکردەوە، ئەویش لە بەرامبەرمدا توونەتر دەبوو! بە چاوە بێ هەستەکانی تێمڕامابوو و هیچیشی نەدەگوت! دەرگای دۆڵابەکەی داخستەوە و لە ژوورەکە چوە دەرێ! لە ژووری میوانان هاوسەرەکەی لێی پرسیم داخوا قاوە دەخۆمەوە

یان نا؟ وەڵامم نەدایەوە! لەو دەستەم دەڕوانی کە بە تەپ و تۆزی مانگ داپۆشرابوو! نەمدەزانی دەستەکانم چۆن و لە کوێ دابنێم! ئەگەر بە حاڵ لە شتێک درابایە، دەسڕایەوە! مێشکم لە خۆڕا زەختی لە خۆی دەکرد بۆ ئەوەی کە جێگایەکی باش بۆ ئەو تەپ و تۆزە بدۆزێتەوە! تارماییەک لە تەپ و تۆز بەرچاوی لێڵ کردبووم و ئەو رستەیەی کە بەر گوێم کەوت، دایڕوخاندم:

ـ وەکو ئاردی برنج وایە! لە هەر شوێنێکی هەڵسووی لە ناو دەچێت!

ئەوە دەردێکی گەورە بوو بۆ من! دەردێک کە تەنانەت تانتاڵیش لە گەڵی بەرەو روو نەبووا! تانتاڵیش کاتێک دەیهەویست میوە لێ بکاتەوە، میوەکان لە بەری هەڵدەهاتن و عەزابیان دەدا!

بۆ دوایین جار لە دەستمم روانی کە هەروا لە حەوا رامگرتبوو! بوغزەکەم قووت دایەوە و بزەیەکم هاتێ! مانگ لەو دوورەوە هاتبوە لام و لە سەر دەستم نیشتبوو! ئێستا من دەبوایە بۆ هەمیشە فڕێی بدەم! تەنانەت ئەگەر حەزیشم لێ بوایە نەمدەتوانی بە درێژایی تەمەنم وەکو پەیکەرێک دەستم قووش کردبایە و لە هیچم نەدابایە! درەنگ یان زوو دەستم لە شتێک دەدرا و هەموو تەپ و تۆزەکە وەکو هەڵم لە ناو دەچوو! تەواوی ئەو روداوانە بۆ رابواردنی گاڵتەجاڕانەی نەفامێکی هیچ و پوچە!

بە تووڕەییەوە دەستم کردە مست و لێکم کردەوە! ئێستا لە سەر بەرە دەستم هێندێک هێڵی خێچ و خوار و پیس بەرچاو دەکەوتن کە هەموویان مرۆڤیان تێک دەدا! بۆ گەیشتن بەو ساتە قیزەونە ئەو هەموە راوەستابووم و

عەزابم کێشابوو؟ بەرە دەستم بە دۆلابەکە سڕیەوە! ئاسەوارەکەی تەنیا وەکو پەڵەیەکی چەور لە سەر دۆلابەکە مایەوە! وەکو جێ شوێنی لیجی شەیتانۆکەیەک! وەکو ئاسەواری فرمێسکێکی گەورە! کاتێک لەو ماڵە هاتمە دەرێ، مانگ پڕ بوو و بە شۆقەکەی رەنگی شەوی سپی هەڵگێڕابوو! کاتێک بە چاوانی مات و لێڵەوە لێی دەڕوانی دەڵێی: مرۆڤ هەتا شتێکی سپی و خاوێن دەدۆزێتەوە، دەچێتە لای و بەو شتانەی کە لە سەری جێی دەیڵێ، پیسی دەکات! دەواتریش لە خۆت دەپرسی: ئاخر بۆچی؟ بۆ؟ بۆ ...

لە میوانخانەکە ئاوەکەم کردەوە و دەستم وەبەر نا! ئاوێکی رەش لە دەستم هەڵچۆڕا ... بچکۆلەکە! دەزانی چۆن بانگی تۆم کرد؟ پێم گوتی: تۆ مانگی منی! تەپ و تۆزی مانگی من ...

دڵئێشەکەم زۆر بوە و ئیتر ناتوانم شۆفێری بکەم! خۆزگە لەم نزیکانە میوانخانەیەکی لێ بوایە با تۆزێک لێی بحەسێمەوە! رەنگە بۆ خۆم بتوانم رێگایەک بۆ دەرباز کردنی شتێک کە شیاوی دەربازکردنە بدۆزمەوە! نابێ بێڵم مانگەکەم لە ناو بچێت! حەز ناکەم سەر لە نوێ مانگم لە کیس بچێت و بە چاوی خۆم ببینم کە لە توالێتەکەدا بزر دەبێت! بەڵام بێ سوودە! هەر بەو دڵنیاییەوە کە ئەو شەوە هەستم بە بوونی تۆ کرد و ئیفلیج بووم، ئێستاش هەروا بە دڵنیاییەوە دەزانم کە تۆ ئیتر نەماوی!

***

سەفەرەکەم بە نیوەچڵی بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ شار! تەلەفۆنم بۆ خانم دوکتۆر کرد! پێی سەیر بوو و بەردەوام دەیگوت:

ـ لە سەر خۆ بە! لە ماوەی ئەم دوو حەوتوویەدا هەموو شتێک ئاسایی بوە! ئەوە تەنیا گومانەکانی تۆیە!

پێم گوت ئەو دڵۆپە خوێنە گەورەیەی کە من بینیم، خۆ خەیاڵات نەبوە! گوتم ماوەی حەوتوویەک لە میوانخانەی نێو ڕێگادا ئیسراحەتم کرد و هەر دڵۆپە خوێنم ژمارد! گوتی خێرا خۆم بگەیەنمە لای! بە بزەیەکی گاڵتەجارانەوە دەرگاکەی بۆ کردمەوە! بەر لەوەیکە ئەو قسەیەک بکات من جلەکانم داکەند! لە سەر قەرەوێڵەکە راکشام! دەستی خستە سەر دڵم و گوتی:

ـ زۆر خێراخێرا لێدەدا! وەکو دەهۆڵ دەنگی دێت!

هیچ وەڵامێکم نەدایەوە! ئیتر بەزەیی ئەو بە کەڵکی من نەدەهات! دەمزانی ئەو بۆنە گاڵتەجارانەیەی کە چەند حەوتوویەک بوو لە چاوەڕوانیدا بووم، دەستی پێکردوە! ئامادەی خۆ بە دەستەوەدان بووم و دەمزانی هیچ کاردانەوەیەکم نابێت! چونکە هەر قسەیەک کە دەبوایە بیکەم، پێشووتر کردبووم و هەر عەزابێکیش کە قەرار بوو بیچێژم، پێشووتر چێژتبووم! بەڵام کاتێک کە مەراسمەکە دەستی پێکرد لە گەڵ شتێک بەرەو روو بووم کە هەر چاوەڕوانیم نەدەکرد! پرسیارەکانی خانم دوکتۆر و ئەو وەڵامانەی کە دامەوە، زیاتر تێکی دام:

ـ لەم دواییانەدا هەستت بە جووڵەجووڵی نەدەکرد؟

ـ نا!

ـ هەستت نەدەکرد کە قورس بووی؟

ـ نا!

ـ لە کەنگێوە هەستت بە ...

ـ لە جادەکەدا، پێش گەیشتن بە میوانخانەکە!

ـ بۆ ئەوەی ئاکامەکەی روون ببێتەوە، هێشتا ماوەتی! من دەبێ بەو ئاکامە بگەم! وایە؟

دواتر دەستێکی بە سکم داهێنا و گوتی: لە چاو رۆژان نیشتۆتەوە!

دەستی لە مەمکەکانم دا و گوتی شلتر و چکۆلەتر بوونەتەوە! دەسکێشە لاستیکەکانی لە دەست کرد و بە شوێن تۆدا دەگەڕا! نێوچاوانی هەڵقرچاند و ورد بۆوە و گوتی:

ـ منداڵدانت زۆر شل و لاواز بوە! وادیارە منداڵەکە باش گەشە ناکات! یان رەنگە لە گەشەکردن وەستابێت! دەبێ تاقیکاریەکی بیۆلۆژیکی بۆ بکەین و چەند رۆژی دیکە چاوەڕوان بین!

دەستکێشەکانی لە دەست دەرهێنان و خستنیە نێو زبڵدانەکەوە! دەستی بەملاولای قەرەویڵەکە گرت و بە نێگایەکی خەماویەوە لێی روانیم و گوتی:

ـ باشتر وایە زووتر راستییەکەت پێ بڵێم! تۆ مافی خۆتە بزانی! منداڵەکە دووسێ حەوتوویە لە گەشەکردن کەوتوە! ورەت بەرز بێت! هەموو شتێک

تەواو بوە! منداڵەکە مردوە! هیچ قسەیەکمان نەکرد! هەر جوڵەم نەکرد و تەنانەت چاویشم نەتروکاندن! هەر لە وێ وەکو بەردێک لەجێی خۆم رەق بووم! مێشکیشم لە کار کەوتبوو و هیچ قسە و وشەیەکی لە خۆیدا جێ نەدەکردەوە! تەنیا شتێک کە هەستم پێکرد قورساییەک بوو کە لە سەر سکم بوو! قورساییەک کە نەدەبیندرا و خەریک بوو دەیپیشاندم! دەتگوت ئاسمان هەموو کێشەکەی خستۆتە سەر من و بە بیدەنگی خەریکی تێک هاڕینم بوو! لەو بێدەنگییە تەماویەدا دەنگی دوکتۆر وەکو تۆپێک لە سەرمدا تەقیەوە:

ـ ورەت بەرز بێت! هەستە جلەکانت لەبەر بکەوە!

هەستام! قاچەکانم رەق ببوون و بۆ جووڵە پێکردنیان پێویستیم بە هێزێک بوو کە لە توانای مرۆڤدا نییە! جلەکانم لەبەر کردەوە و گوێم لە دەنگی خۆم بوو کە پرسیاری دەکرد:

ـ دەبێ چیبکەم؟

ـ هیچ، کۆرپەکە ماوەیەکی دیکەش لەوێدا دەمێنێتەوە و دواتریش بۆ خۆی دەردێت!

سەرم لەقاند! سەر لە نوێ هەر گوێم لەو دەنگە بوو کە هێندێک وشەی لە پشت سەری یەکتر ریز کردبوو سەبارەت بەوەیکە:

ــ نابێ نارەحەت بی! زۆریەک لەمنداڵەکان ساغ و کامڵ نین و هەر بۆ خۆیان لەبار دەچن و تۆ نابێت بۆ گوناهێک کە نەتکردوە، خۆت بە تاوانبار

بزانی! دووگیانی تەنیا کاتێک باشە کە قۆناغی سروشتیی خۆی بڕیبێ! من هێشتاش ڕازی نیم کە ژنانی دووگیان چەند مانگێک لە سەر جێگە بکەون و منداڵەکە لە بارودۆخێکی نائاساییدا ڕاگرن ...

پارەی دوکتۆرەکەم دا! بە ئاماژەیەکی سەر ماڵئاواییم لێکرد! لە ژوورەکەی هاتمە دەرێ! بە نێوان دوو ژندا هاتمە دەرێ کە ئەوانیش سکیان هەڵمسابوو و بە تەشەرەوە لە سکی منیان دەڕوانی کە منداڵێکی مردوشی تێدابوو، لە بەر خۆمەوە گوتم: هەرچی دەبێ با ببێ! دەبێ لە گەڵی ڕابێم و وشەی ڕاهاتنم هەتا میوانخانەکە هەر بەردەوام دووپات دەکردەوە: دەبێ لە گەڵی ڕابێم! ڕابێم! ڕابێم ...

کاتێک گەیشتمەوە ژوورەکەم و چاوم بە جل و ئەو یاریانە کەوت کە بۆم کڕیبووی، ئەو شیوەنەی کە لە دڵمدا ڕامگرتبوو، دەرمبڕی! لە سەر قەرەوێڵەکە کەوتم! ناڵەیەک لە گەرووم هاتە دەرێ، دواتر ناڵەیەکی دیکە و دوای ئەویش یەکی دیکە ... بە ڕادەیەک کە لە ناخمەوە ــ هەر لەو جێگایەوە کە تۆ وەکو کوتە گۆشتێکی بێبایەخ لە سوچێکی کەوتبووی ــ ناڵەکان هاتنە دەرێ و بوغزەکەم بوو بە هەزاران ناڵەناڵ و هاوار و قوروسکاندم و لە هۆش خۆم چووم!

***

لەوانەیە لەو خەوەدا کە دوای لە هۆش خۆ چوونەکەم تێیدا نوقم ببووم، یان کاتێک کە قسەم دەبزڕکاندن هاتە لام! بەڵام زۆر باش لە یادمە! ژوورێکی سپی بوو کە حەوت کورسی و قەفەزێکی تێدا بوو! منیان لە ناو قەفەزەکە

هاویشتبووا لە سەر کورسییەکەی ناوڕاست ئەو دوکتۆرە دانیشتبوو کە من بەر لە سەفەرەکەم دەچوومە لای! لە لای راستی دوکتورێکی ژن دانیشتبوو و لە لای چەپیشی بەرپرسەکەم! دۆستەکەشم لە پاڵ بەرپرسەکەم دانیشتبوو و باوکیشت لە تەنیشتی بوو! لە تەنیشت دوکتۆرە ژنەکەش دایک و باوکی من دانیشتبوون! کەسی تری لێ نەبوو! بە دیوارەکانەوە و لە سەر زەویەکە هیچی لێ نەبوو! زۆر زوو زانیم کە ئەوێ دادگایە و تۆمەتبار منم و ئەوانیش لیژنەی دادوەرین! نەدەترسام! بە تەواوی تەسلیم ببووم! یەک بە یەک لێم روانین! باوکت هەر وەکو ئەو رۆژەی کە لە تەنیشت قەرەوێڵەکەی ئێمە دانیشتبووو سەری خستبۆ نێو دەستەکانیەوە و وردە وردە دەگریا! دایک و باوکیشم سەریان داخستبوو و دەتگوت یان زۆر هیلاکن یان ئازارێکی زۆریان هەیە! دۆستەکەم خەمین بوو و نەشدەکرا لە روخساری ئەوانی تردا شتێک بخوێنمەوە! دوکتۆری یەکەمم لە سەر جێگاکەی هەستا و لە رووی کاغەزەکەوە دەستی کرد بە خوێندنەوە و گوتی:

ـ لیژنەی دادوەری بە بەشداریی تۆمەتبار لێرە کۆبوونەتەوە هەتا کەسێک کە بە بێ لە بەرچاو گرتنی مافی ژیانی کەسێکی تر کە لە مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتییە و بۆتە هۆی مەرگی کۆرپەکەی خۆی، دادگایی بکرێت!

دواتر کاغەزەکەی لە سەر مێزەکە دانا و باسی کارەکانی دادگایەکەی کرد! گوتی کە تاوانبار بوون یان بێتاوانیی ئەو کەسە بە کۆی دەنگەکان دیاری

دەکرێت و هەر ئەوانیش خۆیان رادەی تاوانەکەی دیاری دەکەن! سەرەتا ئەو قسەی کرد! قسەکانی وەکو بایەکی سارد بە لەشمدا هاتن:

ـ خۆ منداڵ ددانی کرمۆڵ نییە! ناکرێ وەکو ددانێکی رزیو لە ریشەوە دەری بێنی و لە لۆکەیەوە پێچی و بیخەیتە ناو زبڵدانەکەوە! کۆرپەلەش مرۆڤە و زیندوویەتی مرۆڤێک لە کاتی گەرابەستنی تۆوەکەوە دەست پێدەکات و هەتا کاتێک کە دەمرێت، درێژەی هەیە! ژمارەیەک لە ئێوە لەگەڵ ئەم قسەیە نایەنەوە و دەڵێن: کاتێک کە تۆوی مرۆڤ گەرا دەبەستێت ئەو وەکو مرۆڤ نایەتە ژمار و تەنیا خانەیەکە کە خانەی دیکەی لێ دەبنەوە و وەکو سەرچاوەی ژیان نایەتە ژمار! وەکو دارێک کە لق شکاندنەوەکەی تاوان نییە و یان مێشێک کە بکوژەکەی بە قاتڵ نایەتە ژمار! لە وەڵامدا دەبێ بڵێم کە لە درەخت مرۆڤ و مێش بەرهەم نایەت! سەرجەم ئامرازەکانی پێکهێنەری مرۆڤ، یانی جەستە و خوێن و روح و کەسایەتیەکەشی لەو خانەیەدا کۆبوونەتەوە! ئەو هۆکارانە یان ئەو ئامرازانەی کە لە بیرکردنەوە و بیرەوەری پڕبایەخترن! ئەگەر بتوانین بە میکرۆسکۆپێک لێی بڕوانین و لێی ورد ببینەوە، هەموومان بە چۆک دادێین و ئیمان بە خوا دێنین! کەواتە من ئیزنی ئەوە بە خۆم دەدەم کە لە وشەی قاتڵ بۆ ئەو تاوانبارە کەڵک وەرگرم! ئەوەش دەبێ بڵێم کە ئەگەر مرۆڤایەتی مرۆڤ یان کەسایەتی مرۆڤ بە کێش و قەوارە هەڵسەنگێنین، بەو ئاکامە دەگەین کە کوشتنی کەسێکی سەد کیلۆیی تاوانەکەی لە کوشتنی کەسێکی پەنجا کیلۆیی قورسترە ... ئەو هاوکارەی کە لە لای دەستمەوە دانیشتوە پێکەنینی بە قسەکانی من دێتێ! جارێ سەبارەت بە بیروباوەڕی ئەو هیچ ناڵێم! بەڵام

ناتوانم له مەڕ نەفامیەکەی لە بواری پزشکیەوە بێدەنگ بم! لەو قەفەزەدا لە جیاتی ژنێک دەبوایە دوو ژنی تێدا بوایە!

دواتر بە تووڕەییەوە لە دوکتورە ژنەکەی روانی! خانم دوکتۆر هەروا و لە سەرخۆ کە جگەرەکەی بە دەستەوە بوو، نیگاکانی ئەوی تەحەمول کرد و ئەو کارەی ئەو وەکو گەرمایەک بە جەستەمدا هات و تۆزێک ئارامی کردمەوە! بەڵام ئەو با ساردە سەر لە نوێ هەڵیکردەوە:

ـ خۆ ئێمە بۆ بڕیاردان لە سەر مەرگی خانەیەک لێرە کۆ نەبووینەتەوە! ئەو دادگایە بۆ کۆرپەیەکە کە سێ مانگ بوو لە سکی دایکی دابوو! چ شتێک بۆتە هۆی مەرگی ئەم کۆرپەیە؟ هۆکاری سروشتی یان ناسروشتی؟ شتێک کە بە چاو نابیندرێت یان ئەو ژنەی کە لە قەفەزکە دایە؟ من بەڵگەی قورس و قایمم بە دەستەوەیە کە دەیسەلمێنێ ئەو ژنەی کە لە قەفەزەکەدایە، قاتڵی کۆرپەکەیە! لە خۆڕا نەبوو کە من هەر لە یەکەم دیداردا گومانم لەو ژنە هەبوو! من بە پێی ئەزموونێک کە هەمە، منداڵکوژەکان دەناسم، جا لە هەر جل و بەرگێک دابن! ئەو ژنەش لە خۆڕا خۆی بە هۆگری منداڵەکەی پیشان دەدا! ئەوە درۆیەک بوو کە ئەو بەر لەوەی کەسانی دیکەی لێ ئاگادار بکات، بە خۆی گوتبوو! من بە داخەوەم بۆ ئەو هەڵسوکەوتە نالەبارەی ئەو! رۆژێک کە بە بینینی وەڵامی شیکاریەکەی خۆشحاڵیم دەربڕی، ئەویش زۆر بە سارد و سڕی گوتی کە خۆشی دەیزانی کە دووگیانە! هەروەها کاتێک کە ئاگادارم کردەوە لەوەیکە بە هۆی وێکهاتنەوەی منداڵدانی چەند حەوتوویەک لەماڵەوە ئیسراحەت بکات، لە کاردانەوەی بێبەزەییانەی ئەو نارەحەت بووم! گوتی ئیزنی ئەوە بە

خۆی نادات کە لەم یاریە مندالآنەیەدا بەشداریی بکات و ناتوانێت زیاتر لە پازدە رۆژ ئیسراحەت بکات! من جەختم لە سەر ئیسراحەتەکەی دەکردەوە و ئەویش نارەحەت بووا تەمەننام لێکرد بەلآم بە هەڵسووکەوتی تێیگەیاندم کە نایهەوێ وەکو دایکێک ئەرکەکانی خۆی بە جێ بێنێت! من تێگەیشتم کە ویژدانی دایکایەتی ئەو ویژدانێکە کە هەست بە بەرپرسیارێتی ناکات! لە ماوەی ئەو دوو حەوتوەی کە لە ماڵەوە لە جێدا بوو، بەردەوام تەلەفۆنی بۆ دەکردم و دەیگوت: حاڵی باشە و نابێ لە جێدا بمێنێتەوە و جەختی لەوە دەکردەوە کە کاری هەیە و دەبێ لە جێیەکەی بێتە دەرێ! سەر لە بەیانی رۆژێکیان کە چاوم پێی کەوت زۆر بێ هیوا بووا هەر لەو دیدارەدا گومانم زیاتر بوو و لە مەبەستە جینایەتکارانەکەی تێگەیشتم! لە بواری جسمی و فیزیۆلۆژیەوە، وا وێدەچوو کە قەڵەویەکەی بە هۆی نارەحەتی و خەم و پەژارەوە دروست بووبێت! ئەو خۆ تێک باڵدانە پڕ ئێش و ئازارانەی سەرچاوەیەکی رەوانییان هەبوو! یانی هەرکاتێک کە تاوانبارەکە بیهەویستبایە، سەریان هەڵدەدا! هۆکارەکەیم لێ پرسی و ئەویش لە وەڵامدا گوتی کە بە هۆی گیروگرفتی روحیەوە هەست بە نارەحەتی دەکات! دواتریش بە منگە منگ پێی گوتم شتێک ئازاری دەدات و منیش پرسیاری ئەو شتەم لێ نەکرد چونکە دەمزانی هۆکارەکەی هەر ئەو دووگیانییەیەتی! پێمگوت کە بیرکردنەوە و خەیالآت زۆر جار دەبنە هۆی مەرگی کۆرپەلە و پرسیارم لێی کرد کە بە راستی کۆرپەکەی دەوێ یان نا؟ پێمگوت کە پێویستە ئەعسابی خۆی ئارام بکاتەوە! ئەو تووڕە بوو و وەڵامی دایەوە کە داخوازێکی ئاوا وەکو ئەوە وایە کە داوای لێبکەم رەنگی چاوەکانی بگۆڕێت! چەند رۆژ لەمەوبەر سەر لەنوێ هاتەوە لام! ژیان و کاری رۆژانەی دەست

پێکردبۆوه و بارودۆخی کۆرپەکە خراپتر بـوو! ئـەوم لـە نەخۆشخانە خەواند! لەوێ بە زەبری دەواودەرمان نەمهێشت بۆ ماوەی هەشت رۆژ جوڵە بکات!

خوشکان و برایان! ئێستاش دەگەینە جینایەتەکە! بەر لە هـەر شـتێک دەڵێم وای دابنێین یەکێک لە ئێوه زۆر نەخۆشە و پێویستی بە دەواودەرمان هەیـە! دەواودەرمانەکە هەیە و تـەنیا ئـەوه ماوەتـەوه کـە کەسێک بتانداتێ! ئێـوه چ ناوێک لـە سـەر کەسێک دادەنێن کـە ئـەو دەوا و دەرمانانـە فڕێبـدات و لـە جیاتی ئەوان ژەهرتان دەرخوارد بدات؟

شێت؟ لە خۆبایی؟ تاوانبـار بەوەیکـە یارمـەتی نـەداون؟ نـا ئـەم وشـانە شیاو نین! من وەها کەسێک بـە قاتـڵ نێـو دەبـەم! ئاغایانی لیژنـەی دادوەری! ئـەو منداڵە نەخۆش بـوو و هەتوانەکەشی تـەنیا و تـەنیا ئیسـراحەتی تـەواوی ئـەو ژنـە بـوو! بـەڵام ئـەو نـە تـەنیا ئیسـراحەتی نـەکرد، بـەڵکو چـوە سـەفەر و لـە جیـاتی دەوا و دەرمـان ژەهـری دەرخـواردی نەخۆشـەکە دا! بـە چەنـدین سـەعات سـەفەر کـردن بـە تـەیارە و لێخـوڕینی ئۆتۆمبێـل، ئـەویش بـە تـاقی تـەنیا و لـە جادەیـەکی پـڕ لـە کەنـد و لەنـد و نارێکـدا! مـن بـە تکـا و رجـا پێمگـوت ئـەو شـتەی کـە لـە سکی تۆدایـە کۆرپەیـە! ئاگـادارم کـردەوە کـە لەوانەیە کۆرپەکە بمرێت! بەڵام ئـەو بـە تووڕەییـەوە وەڵامـی نەسیحەتەکانی منی دایەوە و تەنانەت کاغەزێکیشی ئیمزا کرد و خۆی بەرپرسیارێتی گیانی منداڵەکەی وەئەستۆ گرت! چـوو بـۆ سـەفەر! کۆرپەلەکـەی کوشت! هەڵبەتـە دەزانم کە ئەگەر ئێمە لە دادگایەکی ئاساییدا بـواین، سـەلماندنی تاوانـەکانی ئـەو بـۆ مـن کـارێکی زۆر هاسـان نـەدەبوو! چونکـە دەوا و دەرمـان یـان نەشتەرگەری بۆ لە بار بردنی منداڵەکە بە کار نەهاتوە! بە پێی یاسا باوەکان

ئەو ژنە بە بێتاوان لە قەڵەم دەدرێت، چوونکە هیچ تاوانێک رووی نەداوە ... بەڵام خوشکان و برایان! ئێمە ئەندامی لیژنەی دادوەریی ژیانین و من بە ناوی ژیانەوە وەگوێی ئێوەی هەڵدێنم کە کار و کردەوەی ئەم ژنە لە قەباڵ منداڵەکەیدا لە هەموو نەشتەرگەری و دەواو دەرمانێک بۆ لە بار بردنی خراپتر بوە! هەڵسوکەوتێکی فریوکارانە و بە بێ ترس لە تۆڵە سەندنەوە! من زۆرم هەوڵدا کە هێندێک هۆکاری بۆ داتاشم بۆ ئەوەی لە تاوانەکەی کەم بکەمەوە، بەڵام بە چ شێوەیەک؟ ئایا هەژار بوە؟ نەیدەتوانی پێداویستیەکانی منداڵی داهاتووی دابین بکات؟ هەرگیز! بۆ خۆشی ئەوە بە باشی دەزانێت! ئایا دەترسا بە لە دایک بوونی منداڵێکی ساغ و سەلیم، ناچار بێت لە بەرامبەر کۆمەڵگادا بەرگری لە خۆی بکات؟ نا! ئەو سەر بە دامەزراوەیەکی فەرهەنگییە کە لە دوای لە بار بردنی منداڵەکەی لە جیاتی خستنە پەراوێزیەوە، قارەمانێکی لێ دروست دەکات! ئەو باوەڕی بە هیچکام لە یاسا و رێسا باوەکانی ناو کۆمەڵگا نییە! خوا، وڵات، بنەماڵە و ژیانی هاوبەش ... ئەو حاشا لە سەرجەمی ئەو شتانە دەکات! تاوانی ئەو بەو تایبەتمەندییانەی کە لە ژێر ناوی ئازادەبوون دەستی داونەتێ، سووک نابێتەوە! ئازادیی تاکەکەسی ئازادییەکی خۆپەرەستانەیە کە مافی بێ ئەملاوئەولای کەسانی دیکە پێشێل دەکات! وشەی مافم بەکار هێنا هەتا نەڵێن ئەو ژنە بە کوشتنی منداڵەکەی لە مافی خۆی کەڵکی وەرگرتوە: ئەو مافەی کە بە پشت بەستن بەو دەتوانی بەر بە لە دایکبوونی منداڵێکی نەخۆش یان کەمئەندام بگری! ئەوە ئەرکی ئێمە نییە کە لە پێشدا لە سەر ساغبوون یان کەمئەندامبوونی منداڵێک قسە بکەین! هۆمەر ( یەکێک لە بە نێو بانگترین هونەرمەندانی یۆنان) کوێر بوو و لیئۆناردیش پشتی چەمابۆوە! ئەگەر

ئیسپارتیەکان ئەوانیان لە سەر کێوەکەوە خستبایە خوارەوە، یان دایکەکانیان لە راگرتنی ئەوان لە منداڵدانی خۆیاندا وەزاڵە هاتبانایە، ئێمە ئەمڕۆ لە جیهانێکی هەژاردا دەژیاین! من لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە قارەمانێکی ئولەمپیک لە شاعیرێکی بێتوانا پڕ بایەخترە! بەڵام سەبارەت بە ئاگاداری کردن لە قارەمانێکی ئولەمپیک یان شاعیرێکی بێتوانا دەبێ بڵێم ک مرۆڤ بتهەوێ و نەتهەوێ بیر لە داهاتوویەکی روون بۆ وەها کۆرپەیەک دەکاتەوە! من ئەو ژنە بە تاوانبار دەزانم!

بە دەنگی بەرزی ئەو لە سەر جێگاکەم راپەڕیم و چاوەکانم لە سەر یەک دانان! چاوم لە خانم دوکتۆر نەبوو هەستێت بۆ قسەکردن! کاتێک چاوەکانم هەڵێنا ئەو قسەکانی خۆی دەست پێکردبوو!

ــ هاوکارەکەم لە بیری چۆوە پێمان بڵێت کە لە پاڵ هەر هۆمەرێک، هیتلەرێکیش لە دایک دەبێت! هەموو دووگیانییەک وەکو داهێنانێک وایە کە ئاکامەکەی لەوانەیە دڵخۆشکەر یان مەترسیدار بێت! من نەمدەزانی کە ئەو منداڵە کەسێکی وەکو ژاندراک دەبوو یان هیتلەر! ئێمە هیچکاتێکیش ئەوە نازانین چونکە ئەو مردوە! بەڵام بە باشی ئەو ژنە دەناسم! راستییەکە نابێ لە ناو بچێت! من لە نێوان ئەگەرێکی نادیار و راستییەکی ئاشکرادا ئەوەی دووهەمیان هەڵدەبژێرم! وادیارە خۆشیەکانی ژیان هاوکارەکەمی لە خۆبایی کردوە! بەڵام ئەو ئەم هەیبەتە بە شایانی کەسێک دەزانێت کە هێشتا لە دایک نەببوو نەک کەسێک کە زیندوویە و خەریکی ژیانە! هەیبەتی ژیان تەنیا رستەیەکی رازاوە و بێ کەڵکە! ئەوەیکە منداڵ ددانێکی کرمۆڵ نییە کە بکرێ لە ریشەوە دەری بێنی، دروشمێکی جوانە! گومانم

لەوەدا نییە کە کاتێک هەر ئەو هاوکارە بەرێزەم لە بەرەی شەڕدا تفەنگی دەتەقاند و کەسی دەکوشت، لە بیری چووبۆوە کە منداڵێکی بیست ساڵەش هەر وەک ددانێکی کرمۆڵ نییە! بە هیچ شێوەیەک من لەباربردنی کۆرپەم بە قەدەر شەڕ پێ کارێکی ناحەز و پیس نییە! ئەو گۆڕەپانەی کە لەودا کۆمەڵێک کەسی بیست ساڵە لە ناو دەچن! بەڵام نازانم بۆچی هاوکارەکەم شەڕکردن بە کارێکی مەزن دەزانێت و لە پیشاندانی ئەو کارە لە پاڵ قسەکانیشی خۆی دەبوێرێت! لە بواری زانستیشەوە ناتوانی ئەو بەردەوام بوونە بە جیددی وەرگری! ئەگەر وابێ هەموو جارێک کە هەر هێلکۆکەیەک بە بێ پیتاندن دەمرێ و هەموو جارێک کە دوو سەد میلیۆن ئێسپێرماتۆزۆئید لە ڕێگای چوونە ناو هێلکۆکەوە تێدا دەچن، دەبێ شینی بۆ بگێڕین! کەواتە کاتێکیش یەک ئێسپێڕماتۆزۆئید دەچێتە ناو هێلکۆکەوە، دەبێ بۆ ئەو سەد و نەود و نۆ میلیۆن و نۆ سەد و نەوەد و نۆ هەزار و نۆ سەد و نەوەد و نۆ ئێسپێڕماتۆزۆئیدەی کە نەیانتوانیوە بچنە ناو هێلکۆکەوە و شکستیان خواردوە و مردوون، جارێکی تر شین بگێڕین! ئەوانیش خوا دروستی کردوون! ئەوانیش گیانیان لە بەرە و پڕن لەو شتانەی کە پێویستن بۆ ژیان! ئایا هاوکارەکەم هەتا ئێستا بە میکرۆسکۆپ لەو ئێسپێڕماتۆزۆئیدانەی نەڕوانیوە؟ ئایا هەڵبەز و دابەزی ئەوان کە هەر وەکو ڕەوە بۆقێک دەچێت، نەیبینیوە؟ ئایا لێی نەڕوانیون لە کاتێکدا کە لە گەڵ دیواری هێلکۆکە خەریکی ململانێن و زۆر بە حەز و تاسە و هیواوە سەری تێدەکوتن و لە جموجۆڵیش ناکەون و دەزانن کە بێجووڵەبوون بەرابەرە لە گەڵ مردن! دیمەنێکی ناخۆشە! هاوکارەکەم بە لە بەرچاو نەگرتنی ئەوانە، زوڵم لە هاوڕەگەزەکانی دەکات! نامهەوێ بێحورمەتی بکەم بەڵام ئێستا کە

ئەو ئەوەندە ئیمانی بە ژیانە چۆن دەتوانێ بێدەنگ بێت لە کاتێکدا کە بە میلیۆن ئیسپێرماتۆزۆئید خەریکی مردنن؟ ئەوە یارمەتی نەگەیاندن بە نەخۆشە یان چەشنێکە لە جینایەت؟ دیارە کە جینایەتە! کەواتە دەبێ ئەویش بخرێتە ناو قەفەزەکەوە! ئەگەر ئەو نەچێتە ناو قەفەزەکەوە، یانی ئەو کەسێکی درۆزنە! یانی لە نێوان هەستە جوانەکانیدا گیرۆدە بوە! ئەو هەستەی کە پێی دەڵێت گرفت، لە گەڵ مرۆڤەکان لە دایک نابێت! دەبێ بۆ ئەوانەی کە لە دایک بوون بارودۆخێکی باشتر بۆ ژیانیان دابین بکرێت! من نامهەوێ هاوکارەکەم بە تاوانبار لە قەڵەم بدەم! رەنگە بە هەڵەکردن لە دادوەریەکەمدا حوکم بدرێم و خۆ ناکرێ لیژنەی دادوەریش بە هەڵە حوکم بدرێن! کەواتە شتەکە تەنیا دادوەرییەک بوو و من پەژیوان نیم! دووگیانی ئەو تۆڵەسەندنەوەیە نییە کە سروشت بە هۆی چەند ساتێک بێ ئاگایی بە مرۆڤی دەبەخشێت، موعجیزەیەکە کە دەبێ رەوتی سروشتیی خۆی وەکو درەختەکان و ماسییەکان تێپەڕ بکات! ئەگەر رەوتی دووگیانییەکە بە شێوەیەکی سروشتی نەبێت، ناکرێ ژنەکە ناچار بکرێت کە وەکو کەسانی ئیفلیج چەند مانگ لە سەر جێ بکەوێت! ناکرێ داوا لە ژنەکە بکەین کە چاوپۆشی لە چالاکی و کەسایەتی و ئازادیی خۆی بکات! ئایا ئەو داوایە لەو پیاوەش دەکرێت کە لە کاتی بێ ئاگایی و دووگیانی ژنەکەدا لە گەڵی هاوبەش بوە؟ دیارە هاوکارەکەم ئەو مافەی کە بۆ پیاوانی بە رەوا دەزانێ بۆ ژنانی بە نارەوا لە قەڵەم دەدات! یانی مافی دەسەڵاتداریێتی بە سەر جەستەی خۆشیاندا نەبێت؟ بە رای ئەو، پیاو مێشە هەنگوینەیە و مافی خۆیەتی کە شیرەی گوڵەکان یەک لە دوای یەک بمژێت و ژنیش تەنیا دامودەزگایەکی بەرهەم هێنەرە! لە پیشەی ئێمەدا شتی لەم چەشنە زۆر

روودەدات! دوکتۆرەکانی نەخۆشیەکانی ژنان وای بە باش دەزانن کە نەخۆشەکانیان ئەو بارەبەرە قەڵەو و ئارامانە بن کە ئازادیی هیچ بایەخێکی نییە بە لایانەوە! ئێمە دەبێ دوکتۆرەکان دادگایی بکەین! ئێمە لێرە کۆبووینەتەوە هەتا ژنێک دادگایی بکەین کە بە قەتڵی بە ئەنقەست تۆمەتبارە و ئەو قەتڵەشی بە بیروبۆچوونی خۆی بە ئەنجام گەیاندوە نەک بە کردەوەکانی! من بە چەندین بەڵگەی قورس و قایم تاوانەکانی ئەو ژنە رەتدەکەمەوە! رۆژێک کە من چاوم پێی کەوت و پێم گوت کە بارودۆخی جنینەکە ئاساییە، ئەو ژنە زۆر هێور بۆوە! رۆژێکیشیان کە زانی جنینەکە مردوە خەمێکی قورس لە روخساریدا دیار بووا! لە جیاتی منداڵ لە وشەی جنین کەڵکم وەرگرت! جینن هەتا کاتێک کە لە دایک نەبێ نابێتە منداڵ و ئەوەش تەنیا لە نۆ مانگیدا روو دەدات و هێندێک جاریش لە حەوت مانگیدا! خۆ تازە ئەگەر جنینی ئەو ژنەش بە منداڵ نێو بەرین، دیسانەوە تاوانێک رووی نەداوە!

هاوکاری ئازیز! ئەو ژنە خوازیاری ژیانی خۆی بوە نەک مەرگی جنینەکەی! بە داخەوە لە زۆر بواردا ژیانی ئێمە بەرابەرە لە گەڵ مەرگی کەسانی تر و ژیانی کەسانی دیکەش بەرابەرە لە گەڵ مەرگی ئێمە! ئەگەر کەسێک هێرشمان بکاتە سەر، ئێمەش هێرش دەکەینە سەری! لە یاسادا بەو کارە دەڵێن بەرگری! تەنانەت ئەگەر ئەو ژنە لە مێشکی خۆشیدا خوازیاری مەرگی جنینەکەی بوبێت، ئەو کارەی بۆ بەرگری لە خۆی کردوە و تاوانبار نییە!

دواتر باوکت لە سەر جێگاکەی هەستایە سەر پێ! ئیتر نەدەگریا! بەڵام هەرکە ویستی قسە بکات، سەر لە نوێ لێوی لەرزین و چەناگەی هەڵقرچا و فرمێسکەکانی هاتنە خوارێ! سەری خستە نێو دەستەکانیەوە و کەوتە سەر کورسییەکە! دوکتۆرەکە بە سەریدا گوڕاندی:

ـ لە قسەکردن خۆت دەبوێری؟

باوکت سەری رەزایەتی لەقاند و دوکتۆر پێی گوت:

ـ هەرچی بکەی خۆ ناتوانی لە دەنگدان خۆت بپارێزی!

گریانەکەی باوکت بەکوڵتر بوو! دوکتۆر گوتی:

ـ تکایە رای خۆت دەربڕە!

باوکت بە بێ ئەوەیکە وەڵام بداتەوە، چڵمی هەڵلوشی! دوکتۆرەکە وازی نەهێنا:

ـ تاوانبارە یان بێتاوان!

باوکت هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشایەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی:

ـ تاوانبارە!

شتێکی سەیر رویدا! دۆستەکەم رووی لە باوکت کرد و تفێکی بە سەروچاوان کرد! دواتر لە کاتێکدا کە باوکت خەریک بوو تفەکەی لە سەروچاوی دەسڕیەوە، بە سەریدا قیژاندی:

ـ هیچ و پوچی درۆزن! ئاژەڵ! مەگەر ئەوە تۆ نەبووی کە تەلەفونت بۆ دەکرد و لە سەر لە باربردنەکەی جەختت دەکردەوە؟ مەگەر ئەوە تۆ نەبووی کە بۆ ماوەی دوو مانگ وکوو سەربازێکی راکردوو، خۆت حەشار دابوو؟ مەگەر ئەوە تۆ نەبووی کە دوای پاڕانەوە و لالانەوەی من چویە دیداری؟ هەمیشە هەر وا دەکەی، ئەریٚ؟

ئێوە دەترسن و فەرتەنەکە بە ئێمە دەنێنەوە و دواتریش کە هەموو شتێک هێور بۆوە ئەوجار دێن و رۆڵی باوک دەنوێنن! بە رای تۆ باوکایەتی یانی چی؟ سکێکی هەڵمساو و نالەبار؟ ئێش و ئازاری منداڵبوون؟ عەزابی شیردان بە منداڵ؟ بەرهەمی باوکایەتی وەکو کراسێکی ئوتوکراوی رێک و پێک دێننە بەر دەستتان! ئەگەر هاوسەرگیریتان کردبیٚ تەنیا کارێک کە دەیکەن ئەوەیە کە ناوەکەتان بە منداڵەکە رادەگەیەنن و ئەگەریش وانەبێت وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن! هەموو عەزاب و ئێش و ئازارەکان هەر بۆ ژن دەمێننەوە! ئەگەر ژنێک لە گەڵتان بخەوێت، وکو لەشفرۆشەکان هەڵسوکەوتی لە گەڵ دەکەن! لە هیچ فەرهەنگێکدا لەشفرۆشیی بەو مانایەی تێدا نییە! چەند هەزار ساڵە کە وشەکانتان و نابەرابەریەکانتان و بڕیارەکانتان بە زۆری بە سەر ئێمەدا دادەسەپێنن! بە هەزاران ساڵە کە ئێمەتان لە چوار چێوەی دابونەریتی دایکایەتیدا یەخسیر کردوە! ئێوە لە هەر ژنێکدا بە شوێن دایکێکدا دەگەڕێن! لە هەموو ژنێک و تەنانەت لە کچەکەشتان چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە رۆڵی دایکتان بۆ ببینێت! دەڵێن ئێمە بە قەدەر ئێوە تاقەتمان نییە و هەر لەم قسەیە بە شێوەیەکی بەرئاوەژوو کەڵک وەردەگرن و ناچارمان دەکەن کە تەنانەت کەوشەکانیشتان بۆیاخ بکەین! بە ئێمە دەڵێن بیٚ مێشک، بەڵام لە زاکیرەی ئێمە بۆ هەموو شتێک

و تەنانەت بۆ باشتر کردنی بارودۆخی ئابووریشتان کەڵک وەردەگرن! ئێوە هەمیشە بە منداڵی دەمێننەوە! تەنانەت کاتێکیش ریشتان سپی دەبێت هەر وەکو منداڵ وان! ئەو منداڵانەی کە ئێمە دەبێ چێشتتان بە دەمەوە بکەین و تەڕ و وشکتان بکەین و کاتێکیش کە بە ساڵا چوون دەبێ ئاگاداریتان لێ بکەین! لێتان بێزارم! لە خۆشمان بێزارم! چونکە ناتوانین بە بێ ئێوە بژین و هاوار بکەین کە دایکایەتی ئیتر بەسە! لە وشەی دایک کە ئێوە بە قازانجی خۆتان کردووتانە بە شتێکی پیرۆز، وەڕەس بووین! دەبێ تفێکیش بە سەروچاوی ئێوە بکەم! ئاغای دوکتۆر! بە رای تۆ، ژن، منداڵدان و هێلکەدان و شتێک بە ناوی مێشک لە ناخیدا هەیە؟ ئێوە کاتێک چاوتان بە ژنێکی دووگیان دەکەوێت لە دڵی خۆتاندا دەڵێن: کەیفی خۆی کردوە و ئێستاش هاتۆتە لای من! ئێوە قەت بە کەیفی خۆتان راتان نەبواردوە؟ ئاغای دوکتۆر! قەت تا ئێستا بۆ چەند ساتێکیش خۆشیەکانی ژیانت لە بیر نەچۆتەوە؟ وەها بەرگری لەم ژیانە خۆشە دەکەی کە مرۆڤ هەستدەکات ئیرەیی دەبەی بەو شتەی کە خانم دوکتۆر پێیدەڵێت موعجیزەی دایکایەتی! بەڵام وا نییە! ناتوانێ وابێ! ئەو موعجیزەیە لە روانگەی تۆوە چەشنێک فیداکارییە کە وەکو پیاوێک حەز ناکەی لە گەڵی بەرەوروو بیتەوە! ئەو دادگاییە تەنیا دادگایی کردنی ژنێک نییە! دادگایی کردنی هەموو ژنەکانی جیهانە! کەواتە من ئەوە بەمافی خۆم دەزانم کە پێتان بڵێم کە دایکایەتی ئەرکێکی ئەخلاقی نییە! ئەرکێکی زانستیش نییە! هەڵبژاردنێکە کە لە عەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت! ئەو ژنە بە پرس کردن بە عەقڵی خۆی بڕیاری داوە و هیچکاتێکیش نەیهەویستوە کەسێک بکوژێت! ئەوە تۆ بووی ــ ئاغای دوکتۆر ــ کە دەتهەویست بەر بە بیرکردنەوەی ئەو ژنە بگری و بیکوژی! کەواتە جێگای

تۆ لەو قەفەزە دایە! نەک بە خاتری کوشتنی بە میلیارد ئیسپێرماتۆزۆئیدی هیچ و پووچ، بەڵکو بە خاتری ژنکوژی! دوای ئەم قسانە ئیتر بە پێویستی نازانم بڵێم کە ئەو کەسەی تۆمەتی خراوەتە پاڵ، تاوانبارە یان نا!

دواتر بەرپرسەکەم بە نیگەرانییەکەی درۆینەوە لە سەر جێگاکەی هەستایە سەرپێ! نەیدەزانی باسی چی بکات چوونکە پێیوابوو ئەو دادگایە پەیوەندیی بە ئەوەوە نییە! گوتی کە کەسەکانی دیکەی لیژنەی دادوەری یان لە بەر پیشەکەیان یان بە هۆی هاوخەمی لەگەڵ تۆمەتبارەوە بە چەشنێک پەیوەندییان بە منداڵەکەوە هەبوە، بەڵام ئەو تەنیا خاوەنکاری تۆمەتبارەکە بووە و ئەویش لەم پێشهاتە خۆشحاڵ بوو! ئەو وەکو خاوەنکارێک ئەو دووگیانیەی بە رووداوێکی هەژێنەر دەزانی کە لەوانە بوو زۆر گران لە سەری بوەستێت! ناچار بوو بە پێی یاسا لەکاتی مانەوە لە ماڵیش حەقدەستی کارمەندەکەی هەر بداتێ! بە رای ئەو منداڵەکە لە دایکی عاقڵتر بوو و رێک لەکاتێکی گونجاودا هەموو شتێکی چارەسەر کردبوو و گرفتێک نەمابۆوە! خەڵکی کاتێک کە کارمەندە سەڵتەکەی ئەویان بینیبایە کە منداڵێکی بە باوەشەوەیە، چییان پێدەگوت؟ بی ئەوەیکە هیچ گومانێکی لە قسەکردنەکەی هەبێ گوتی ئەگەر ژنی راگرتبایە، ئامادە بوو ئەو کێشەیە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە! بەڵام سەرەڕای هەمووی ئەوانە ئەو بێجگە لە خاوەنکار، مرۆڤێکیش بوو و قسە و کردەوەکانی ئەو کەسانەی کە تا ئەوکات قسەیان کردبوو، کاریگەرییان لە سەر ئەویش دانابوو! دوکتۆرە پیاوەکە بە چۆنیەتی بیرکردنەوەکەی و باوکی منداڵەکەش بەگریان! منداڵ هەم هی دایکە و هەمیش هی باوکە! ئەگەر قەتڵێک روویدابێت، قەتڵێکی دوو لایەنەیە، چوونکە لە لایەکەوە ئەو منداڵە لە ناو چوو بوو و لە لایەکی دیکەشەوە

ژیانی کەسێکی تریش ژێروژوور ببوو! کەواتە سەرەتا دەبوایە بسەلمایە کە قەتڵێک روویداوە یان نا؟ بەڵام بۆ دەکرا گومان بخرێتە سەر ئەم کارە؟ بۆ مەگەر هیچ هۆکارێکی قایمتر لە قسەکانی ئەو دوکتۆرە دەدۆزرایەوە؟ دوکتۆر بەو قسانەی کە سەبارەت بە خۆپەرەستی دایکی منداڵەکە کردنی، ئیتر هیچ رێگایەکی بۆ لێبووردن و و لێخۆشبوون نەهێشتەوە! بەرپرسەکەم بە پێی ویژدانی خۆی دەبوایە لایەنە شاراوەکانی ئەو شتەی بدرکاندبایە و ئەو کارەشی کرد! گوتی تۆمەتبارەکە ترساوە لەوەیکە ئەو راسپاردە گرینگە بە هاوکارێکی دیکەی کە رەکەبەری ئەویش بوو، بسپێردرێت و هەر بۆیە بە بێ هیچ بەزەییەک بەرامبەر بەو شتەی کە لە سکی دابوو، لە جێگا هاتە دەر! دۆستەکەم دەیتوانی تفێکیش بە سەروچاوی ئەو بکات و سەرجەم بێعەداڵەتیەکان ئیدانە بکات، بەڵام دیسانەوەش بە بڕوای ئەو تۆمەتبارەکە گوناهکارە!

لەو ساتەوەختەدا نیگام بە شوێن دایک و باوکمدا وێڵ بوو! بە زمانی بێ زمانی لێیان دەپاڕامەوە چونکە ئەوان دوایین ئەگەری رزگاریدەری من بوون! ئەوانیش بە نیگای بێ هیوایی وەڵامی نیگاکانمیان دایەوە!

ئەوان زۆر هیلاکتر و بە ساڵاچووتر لە کاتی دەسپێکی دادگاکە دەهاتنە بەر چاو! سەریان بە لەشیانەوە رانەدەگرت و وەکو بی دەلەرزین! خەریک بوو لە ژێر باری خەم و خەفەتێکدا کە ئەوانیشی داگرتبوو، تیدا دەچوون! لە ناهومێدییەکدا پێکەوە بەشدار بوون! دەستی یەکتریان گرتبوو! ئیزنیان خواست کە هەروا بە دانیشتنەوە پێکەوە قسە بکەن! ئیزنیان دان و چاوم لێ

بوو کە خەریکی هاوفکری بوون بۆ ئەوەی بزانن کامیان لە پێشدا قسە بکات! سەرەتا باوکم دەستی پێکرد:

ـ من لەم بەسەرهاتەدا دووجار تووشی ئازار بووم! جاری یەکەم ئەو کاتە بوو کە زانیم دووگیانە و جاری دووهەمیش کاتێک کە زانیم کۆرپەلەکە مردوە! هیوادارم جاری سێهەم کە سزادانی کچەکەمە نەیەتە پێشەوە! نازانم ئەم شتانە چۆن روویاندا؟ هیچکام لە ئێوەش نازانن! چونکە هیچکەس ئاگای لە دڵی کەسی دیکە نییە! سەرەڕای هەمووی ئەو قسانە ئەو کچی منە و لە روانگەی باوکێکەوە هیچ منداڵێک تاوانبار نییە!

هەر رێک دوای باوکم دایکیشم دەستی پێکرد:

ـ ئەو کچە منداڵی منە! هەمیشەش هەر خۆشەویستە بە لامەوە! کچە چکۆلەکەی خۆم هیچکات کاری خراپ ناکات! کاتێک لە دووگیانبوونی خۆی ئاگاداری کردم، لە وەڵامدا بۆم نوسی: هەر بڕیارێک کە خۆت بیدەی دروستە! ئەگەر بیگوتبایە دەمهەوێ منداڵەکە لەبار بەرم، دیسانەوە وەڵامی من هەر ئەوە دەبوو! دادوەری لە بارەی ئەم کارەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئێمەوە نییە! ئێوە نە مافی ئەوەتان هەیە کە بەرگریی لێبکەن و نە تاوانباریشی بکەن! چونکە ئاگاتان لە دەروونی ئەو نییە! هیچکام لە شایەتیەکانتان هیچ بایەخێکی نییە! هیچ شایەتێک ناتوانێت پێمان بڵێت کە چی روویداوە؟ تەنیا شایەتی راستەقینە منداڵەکەیەتی کە ...

هەر لەو کاتەدا کەسەکانی تر قسەی دایکمیان بڕی و دەستیانکرد بە هات و هاوار:

ـ منداڵ! منداڵ!

منیش تووند دەستم بە تەلی قەفەزەکە گرت و هاوارم کرد:

ـ باسی منداڵ مەکەن! باسی مەکەن!

دواتر هەروا کە خەریکی هاوار کردن بووم ...

بەڵێ هەر ڕێک بەو چەشنەی کە هاوارم دەکرد، لە ناکاو گوێم لە دەنگت بوو:

ـ دایکە!

دڵم داخورپا چوونکە یەکەم جار بوو کە یەکێک بە دایک بانگم بکات، چوونکە یەکەم جار بوو کە گوێم لە دەنگی تۆ دەبوو! دەنگت، دەنگی منداڵێک نەبوو! دەنگی کەسێکی گەورە بوو، دەنگی پیاوێک! بیرم کردەوە، پیاوێک بوو! لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەویش پیاوە و لەوانەیە ئەویش تاوانبارم بکات! لە بەر خۆمەوە گوتم: دەبێ بیبینم! دواتر چاوەکانم هەڵێنا و بە شوێن خاوەنی دەنگەکەدا دەگەڕام! لە نێو قەفەزەکەدا، لە دەرەوەی قەفەزەکە، لە نێو کورسیەکان، لە سەر کورسیەکان، لە سەر زەوی و لە سەر دیوارەکان ... بەڵام نەمدۆزیەوە! تۆ لەوێ نەبووی! بێجگە لە بێدەنگییەکی وەکو بێدەنگیی نێو قەبرستان، هیچ شتێک لەوێ نەبوو! بەڵام دیسانەوە دەنگت بەرز بۆوە:

ـ دایکە! بێڵە با قسە بکەم! مەترسە! نابێ لە ڕاستیەکان بترسی! تازە ئەوان خەریکن ڕاستیەکان دەڵێن! بۆ خۆت باش دەزانی! بۆ خۆت پێت گوتم کە

راستی لە لە پاڵ یەک دانانی راستییە جۆراوجۆرەکان پێکدێت! ئەوانەی کە خەریکن تاوانبارت دەکەن، رێک هەر وەکو ئەوانەی کە بەرگریت لێدەکەن ئەوە مافی خۆیانە! بەڵام دادوەریەکەیان گرینگ نییە! دایک و باوکت راست دەکەن کە دەڵێن ناکرێ لە ناخی کەسێکی تر ئاگادار بی! تەنیا شایەتی تۆ منم! تەنیا من دەتوانم بە هەموان بڵێم کە تۆ بێ ئەوەیکە بتهەوێ من بکوژی، کوژتتم! تەنیا من دەتوانم بڵێم کە بە چی شێوەیەک و بۆچی مەبەستێک ئەو کارەت کرد! من نەمدەویست چاوم بە ژین بپشکوێت! دایکە! هیچکەس بەوە رازی نییە! لەو خوارەدا، لەو جێگایەی کە ئێوە بە هیچی دادەنێن، هیچکەس حەز ناکات لە دایک ببێت! لێرە هیچ هەڵبژاردنێک لە گۆڕێدا نییە و هیچ شتێکی تری لێ نییە! کاتێک جووڵەیەک دەست پێدەکات ئێمە لێی ئاگادار دەبین و لە خۆمان ناپرسین کە کێ ئەو بڕیارەی داوە و ئایا ئەم بڕیارە باشە یان خراپ! تەنیا قەبوڵی دەکەین و چاوەڕێ دەبین هەتا دواتر بزانین لە گەڵ ئەم بڕیارە رادێین یان نا؟ من زۆر زوو هەستم بە رازی بوونی خۆم کرد! تۆش سەرەڕای ئەو ترس و دوودڵیەی کە هەتبوو زۆر زوو منت بەو قەناعەتە گەیاند کە ژیان جوانە و هیچ شتێک نییە کە لە هیچەوە سەرچاوەی گرتبێ! گوتت کاتێک لە دایک بووی، ئیتر نابێ بێ هیوا بی و دەرد و ئازار هیوا بڕاوت بکات! کاتێک کەسێک دەمرێت، یانی سەر لە نوێ لە دایک دەبێتەوە، چونکە لە هیچەوە سەریهەڵداوە! هیچ بوون لە نەبوون خراپتر نییە! خراپترین شت ئەوەیە کە کەسێک ناچار بێت بڵێت من هیچکات لە دایک نەبووم! ئەو لە خۆبایی بوون و دڵنیاییەی کە لە قسەکانتدا بوو سەری لە من شێواند! هەر رێک بەو چەشنەی کە پێت گوتبووم، ژیان چەکەرەی دا! من باوەڕم بە

قسەکانت دەکرد! دایکە! لە گەڵ ئەو ئاوەی کە چوار دەوری تەنیبووم، بیرکردنەوەکانیشتم دڵۆپ دڵۆپ دەخواردنەوە! هەر بیرکردنەوەیەکت پەیامێکی تێدابوو بۆ من! خۆ نەدەکرا شتێکی غەیری ئەوە بێت! جەستەی من خەیاڵێک بوو کە تەنیا بە بەرەکەتی بوونی تۆ گەورە دەبوو! روحی من خەیاڵێک بوو کە خەریک بوو لە تۆ و بوونی تۆوە سەرچاوەی دەگرت! هەرچی بتگوتبایە، فێری دەبووم و هەر شتێکیش کە باست نەکردبایە، بیرم لێی نەدەکردەوە! سەرچاوە و ویژدانم تۆ بووی! کاتێک بۆ لە دایکبوونی من لە گەڵ هەموو شتێک بەشەڕ دەهاتی، پێموابوو کە ژیان بە راستی نیعمەتێکی گەورەیە ... بەڵام وردە وردە شک و گومانت زۆرتر بوو! جاری وابوو بە باشی باست دەکردم و جاری وابوو قسەی ناخۆشیشت پێدەگوتم! جاری وابوو خۆشت دەویستم و جاری واش هەبوو قینت لێ بووم، جاری وابوو بە جەربەزە بووی و جاری وابوو ترسنۆک! رۆژێکیان بۆ ئەوەی لە چنگی ترس رزگارت بێت، بڕیاری لە دایکبوونی منت خستە ئەستۆی خۆم! گوتت خەریکی بڕیارەکانی من جێبەجێ دەکەی و بۆ خۆت حەزت لەو کارە نییە! منت بەوە تاوانبار کرد کە خاوەنی تۆم! گوتت تۆ بوویتە قوربانیی من، نەک من قوربانیی تۆ! منت سەرکۆنە دەکرد و دەتگوت کە ئازارم دەدەی! تەنانەت لە گەڵ منیش بە شەڕ دەهاتی و دەتگوت کە ژیان هەر ئەوەیە: قەفەزێکی بێبەری لە ئازادی و بەختەوەری و عەشق! چاڵێکی پڕاوپڕ لە کۆیلەتی کە من هیچکات ناتوانم لێی دەرباز بم! دەتهەویست پیشانمی بدەی کە لە هێلانەی مێرولەکاندا هیچ باسێک لە رزگاریی نییە و هیچکەس ناتوانێ لە یاسا نالەبارەکانی خۆی دەرباز بکات! گوڵەکانی ماگنۆلیا تەنیا بە کەڵکی ئەوە دێن کە ژنەکان فرێدەنە سەریان! کەسانێکیش شوکلاتەکان

دەخۆن کە هەر حەزیان لێیان نییە! داهاتوو ئەو پیاوە بوو کە بۆ پارەوە نانێک و چەند کوتە کاغەزێک دەکوژرێت! سەرجەم چیرۆکەکانت بە رستەیەک کۆتاییان پێدەهات: ئایا بە راستی پێویست دەکات کە لەو هێلانە پارێزراو و هێمنەت بێیتە دەرێ؟ هیچکات پێت نەگووتم کە بە بێ ئەوەی بکوژرێی، دەکرێ گوڵی ماگنۆلیاش لێ بکەیتەوە، نەتگوت بە بێ سوکایەتی پێکردنیش دەکرێ شوکلات بخۆی، نەتگوت داهاتوو دەتوانێ لە رابردوو باشتر بێت! کاتێک وەخۆت هاتیەوە، ئیتر زۆر درەنگ ببوو! من خۆم خۆم کوشتبوو ... دایکە! مەگری! دەزانم کە تۆ بە خاتری خۆشەویستیت بۆ من ئەو قسانەت دەکرد و حەزت دەکرد رۆژێک کە لە گەڵ مەترسیی لە دایکبوون بەرەورووو دەبم، پەژیوان نەبمەوە! ئەوە درۆیە کە تۆ ئیمانت بە عەشق نییە! دایکە! تۆ لەو کاتەوە کە لە دایک بووی، ئیمانت بە عەشق هەبوە، بەڵام هەمیشە ئەوت بە کەمتر لە ویستەکانی دیکەت زانیوە! عەشق هیچکات بۆ تۆ بە بێ کەموکوڕی نەبوە! تۆ لە عەشق بەرهەم هاتووی! بەڵام من هەر ئەو کات کە زانیم ئیمانت بە ژیان نییە و خەریکی زەخت لە خۆت دەکەی بۆ ئەوەی بژی و منیشت ببێت، دوایین بڕیاری خۆم دەرکرد! لە لەدایکبوون پەژیوان بوومەوە و تۆشم بۆ جاری دووهەم لە گەیشتن بە مانگ بێبەش کرد! ئەوکات زۆر بە هێز بووم! دایکە! ئەم بیرکردنەوەیە هی خۆم بوو نەک هی تۆ! دەزانم زۆرم مابوو بەڵام دەمتوانی سەبارەت بەو شتە سانایە بڕیار بدەم کە ئەگەر ژیان جۆرێک ئەشکەنجەیە، ئەی بۆ دەبێ قەبوڵی بکەم؟ تۆ هیچکات پێت نەگوتم مرۆڤ بۆچی لە دایک دەبێت؟ تۆ لەوە ساویلکەتر بووی کە پێتوابێت رەنگە ئەو چیرۆکانەی کە بۆ هێورکردنەوەی خۆت باسیان دەکەی، من بە هەڵەدا بەرن! تەنیا شتێک کە شرۆڤەت کرد

ئەوە بوو کە تۆ لە دایک بووی و بەر لە تۆش دایکت و بەر لەویش دایکی و ... ئەم زنجیرە هەروا بەرەو دواوە دەگەڕایەوە هەتا سەرجەم دەرکەوتەکان ون ببن! لەو زنجیرەیەدا ئێمەش لە دایک دەبین چونکە کەسانی تریش لە دایک بوون و دەبن! شەوێکیان پێت گوتم ئەگەر وانەبوایە مرۆڤایەتی لە ناو دەچوو و ئەوکات ئیتر مرۆڤێک نەدەما! بەڵام بۆچی دەبێ مرۆڤایەتی هەبێ؟ دایکە! بۆ ناچاری کە بژی؟ ئامانج لەم بوونە چییە؟ من پێت دەڵێم: تەنیا ئامانج لە چاوەڕوانی مەرگدا دانیشتنە! لە جیهانی مندا ئامانجێک بە ناوی لە دایکبوون هەبوو و تەواو! بەڵام لە جیهانی تۆدا هیچ ئامانجێک نییە بێجگە لە مەرگ! کۆتایی ژیان هەر مەرگە! من نازانم بۆ دەبوایە لە هیچەوە سەرم دەربێنایە بۆ ئەوەی دووبارە ببمەوە بە هیچ!

ئێستا دەزانم کە چ خراپەیەکم لە گەڵ تۆش و لە گەڵ خۆشم کردوە ... و هەروەها لەگەڵ ئەو شتانەش کە هەوڵمدەدا ئیمانیان پێ بێنم: لە دایکبوون بۆ خۆشحاڵی، ئازادی، باشی، تێکۆشان، زانین، داهێنان، بەرهەم هێنان ... و نەمردن! بۆ دەربازبوون لەم ترسە، خۆزگەم دەخواست کە هەموو شتێک خەوێکی ناخۆش بێت! دەمهەویست کاتێک کە لەو نەهامەتییە دەرباز بووم تۆ لە ناو سکی خۆمدا بە زیندوویی بدۆزمەوە و هەموو شتێک لە سەرەتاوە دەست پێبکاتەوە! بێ ئەوەیکە بترسم، بێ ئەوەیکە پەلە بکەم، بێ ئەوەیکە ئیمان و هیوام لە دەست بدەم، قەفەزەکەم رادەتەکاند و دەمگوت خۆ قەفەزی لێ نییە! بەڵام قەفەزەکە لەوێ بوو! بە راستی لە جێگای تاوانبارەکان دانیشتبووم و هەر بە راستیش دادگایی دەکرام! دادگایەک کە لەودا تۆ منت بە تاوانبار دەزانی چونکە بۆ خۆشم هەر لە سەر ئەو باوەڕە بووم! تۆ منت تۆمەتبار کردبوو، چونکە خۆیشم خۆم بە تۆمەتبار دەزانی!

ئێستا هەر مابۆوە بڕیارەکە دەربکەن! بڕیارەکە روون و ئاشکرا بوو: دابڕان لە ژیان و گەڕانەوە بۆ نابوتی ... یانی هەر ئەو جێگایەی کە تۆی لێی! دەستم بۆ درێژ کردی و لە بەرت پاڕامەوە بۆ ئەوەی منیش لە گەڵ خۆت بەری!

هاتیە لام و گوتت:

ـ من دەتبوورم! دایکە! ... مەگری! جارێکی تر لە دایک دەبمەوە!

بچکۆلەکە! وشەکان زۆر جوان بوون! بەڵام ئەوانە تەنیا چەند وشەن و هیچی دیکە! سەرجەم ئێسپێرماتۆزۆئیدەکان و هێلکۆکەکانی جیهانیش ئەگەر دەست بدەنە دەستی یەکەوە، ئیتر ناتوانن تۆ و ئەو شتەی کە بووی و دەکرا ببی، بەرهەم بێننەوە! تۆ ئیتر هیچکات لە دایک نابی و منیش لە بێ هیواییەکی تەواودا، خەریکم لەگەڵت دەدوێم!

***

ئێستا چەند رۆژ بە سەر بەندبوونی تۆدا تێپەڕ دەبێت! تۆ لەوێی بێ ئەوەیکە بژی یان بڕۆی! خانم دوکتۆر لەم بەسەرهاتە نیگەرانە! دەڵێن ئەگەر دەرت نەهێنن لەوانەیە بمرم! لە مەبەستەکەی تێدەگەم و لە وەڵامدا گوتم: هەرحەز ناکەم تا ئەو رادەیە خۆم تەنبێ بکەم و تۆ بکەمە ئامرازی بە کردەوە دەرهێنانی ئەو حوکمەی کە خۆم لە دادگا بۆ خۆم دیاریم کرد! رۆژگارێک پەژیوانیم بەسە! بەڵام ناتوانم بۆ دەرهێنانی تۆ لە سکم پەلە بکەم! نازانم هۆکاری ئەو هەستەی من چییە؟ رەنگە هۆکارەکەی ئەوە بێت

کە من و تۆ لە گەڵ پێکەوە بوون، خەوتن و لە گەڵ یەک هەستانەوە راهاتبین و سەرەڕای ئەوەیکە تۆش لام بووی، من هەر تەنیا بووم بێ ئەوەیکە هەست بە تەنیایی بکەم! رەنگە هێشتاش هەر سەرقاڵی ئەو خەیاڵە پوچە بم کە رەنگە لێکدانەوەی دوکتۆرەکان هەڵە بوبێ و باشتر وایە جارێ چاوەڕوان بم! رەنگە نەمهەوێ سەر لە نوێ ببمەوە بەو کەسەی کە بەر لە هاتنی تۆ بووم! زۆرم حەز دەکرد کە تووشی چارەنوسی خۆم ببمەوە و ئێستا تووشی بوومەتەوە! شتەکانی تر گرینگ نین بەلامەوە! ئەوەش راستییەکە لە نێو هەموو راستیەکانی تردا کە تۆ شانسی زانینیت لە دەست دا: لە ئاگری چاوەڕوانی سەروەت و عەشق و ئازادیدا دەسووتێی و دەتوێیتەوە، بۆ دەستەبەرکردنی مافی خۆت لە پێ دەکەوی، بەڵام کاتێک دەستەبەریشی دەکەی، هیچ تام و چێژێکت پێ نابەخشێت! کەواتە بە فیرۆی دەدەی و لێی دەگەڕێی، حەز دەکەی بگەڕێیتەوە دواوە و بجەنگی و ئازار بچێژی! کاتێک دەگەیتە خۆزگەکانت، هەست دەکەی ونت کردوە! خۆزگە بەو کەسانەی کە بە خۆیان دەڵێن: حەز دەکەم هەر بە رێگا دابڕۆم، نامهەوێ بگەمە هیچ شوێنێک! چارەڕەش ئەو کەسانەن کە بە خۆیان دەڵێن: دەمهەوێ بگەمە مەبەست! گەیشتن یانی مردن! مرۆڤ لە ناو رێگادا تەنیا دەتوانێت چەند ساتێکی کورت پشوو بدات! خۆزگە دەمتوانی خۆم بەو قەناعەتە بگەیەنم کە تۆ پشوویەکی کورت ماوە بووی و مردنی کەسێک ناتوانێ ژیان لەگەڕ بخات! خۆم بەو قەناعەتە بگەیەنم کە ژیان هیچ پێویستییەکی بە تۆ نەبوە و ئەو ئێش و ئازارەش لە شوێنی خۆیدا بە کەڵک هاتوە! بەڵام منداڵێک کە دەمرێ و دایکێک کە لە لەدایکبوونی پەژیوان دەبێتەوە، ئیتر بە کەڵکی چی دێت؟ بە کەڵکی کەسانی بە ئەخلاق، کەسانی مەزهەبی، یان کەسانی

شۆڕشـگێڕ؟ کەواتـە دەبـێ لـە خـۆم بپرسـم کـە کامێـک لـەم گروپانـە لـەم بەسـەرهاتە قـازانج دەکـەن و بڕیـاری دادگایـەکیش کـە ئـاوا کەسـانێک بەڕێوەی بەرن، دەبێ چی بێت؟ بە شیاوی لێبووردنم دەزانن یان سزادان؟ بـۆ کەسانی بـە ئـەخلاق و مەزهـەبی و شۆڕشگێڕ بـە کـەڵک بـووم یـان نـا؟ گوناهی من ئەوە بوە کە بوومەتە هۆی خۆکوژیی و مردنت، یان ئەوەیکە لە خەیاڵی خۆمدا روحێکم بۆ وێنا کردووی کە تۆ خاوەنی نەبووی؟

چاولێکە بزانە بە چ شێوەیەک قسە دەکەن و هاوار دەکەن کە:

ـ ئەو ژنە بێحورمەتی بە خوا کردوە!

ـ رێزی لە ژنەکان نەگرتوە!

ـ لە دەست گیروگرفتەکان رایکردوە!

ـ لە گەڵ شتی هیچ و پوچ خۆی پێوە کردوە!

ـ دەڵێ ژیان پیرۆزە!

ـ دەڵێ ژیان گاڵتە جارە!

خۆزگە گرێ کوێرەی بـوون یان نـەبوون بـەم یاسا یان ئـەو یاسا چارەسـەر دەکرا و هـەر کەسێک بـۆ خـۆی رێگا چارەیـەکی بـۆ نەدۆزیبایـەوە! خۆزگـە دۆزینەوی راستییەک، راستییە پێچەوانـەکانی تـری دەرنەخستبایەن! خۆزگـە هەموو راستیەکان دروست نەبوایـەن! ئامانجی دادگایی و شـەڕەکانی ئـەوان چییـە؟ دەیانهـەوێ هـەموان لـەوە تێبگەیـەنن کـە چ شـتێک دروسـتە و چ

شتێک نادروسته؟ دەیانهەوێ عەداڵەت پیشانی هەموان بدەن؟ تۆ باشی بۆ چووی! بچکۆلەکە! راستی لە هەموو شوێنێک هەیە! ویژدانی هەر کەسێک لە هەزاران ویژدانی جۆراوجۆر دروست بوە! من هەر ئەو دوکتۆرەم و ئەو خانم دوکتۆرەش هەر ئەو بەرپرسەیە و دۆستەکەشم هەر باوکمە و دایکیش منم، تۆی! من هەر ئەو شتەم کە هەمووتان پێتان گوتم!

باوکت سەر لە نوێ نامەی بۆ نوسیم! ئەمجارەیان نامەکەی، منی بردە نێو خەیاڵاتەوە! نوسیویەتی:

ــ من بە باشی تۆ دەناسم و نامهەوێ دڵخۆشیت بدەمەوە و بڵێم کاری باشت کرد کە منداڵەکەت فیدای خۆت کرد و خۆت فیدای منداڵەکەت نەکرد! بۆ خۆت لە من باشتر دەزانی! بۆ خۆت بە سەر منتدا قیژاند و گوتت کە ژن وەکو مریشک نییە و هەموو مریشکەکان لە سەر هێلکەکانیان هەڵنانیشن و زۆریان هێلکەکان بە جێ دێڵن یان دەیانخۆن! ئێمەش تاوانباریان ناکەین، چونکە سروشت تاوانبار نییە! هەر ئەو سروشتەی کە بە نەخۆشیەکان و بوومەلەرزەکانی مرۆڤە بێتاوانەکانی دەکوژێت! هێندە بە باشی دەتناسم کە وەبیرتی ناهێنمەوە کە بێبەزەیی بوونی سروشت و کاری ئەو مریشکانە مەنتق و حیکمەتێکی تێدایە! ئەگەر هەر ئەگەرێکی زیندوو بوون، زیندەوەرێکی لێ بەرهەم بێت، زۆر زوو لە بەر بێ جێ و رێی دەمرین! تۆ لە من باشتر دەزانی کە بوونی هیچ مرۆڤێک پێویست نییە و جیهان بە بێ هۆمەر و ئەیکار و داوینچی و مەسیحیش درێژەی دەبوو! ئەو منداڵەی کە حەزت بە بوونی نەکرد، دوای نەمانیشی هیچ بۆشاییەک بە

جێ ناهێڵێ! نەبوونی نە زیان بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت و نە بە داهاتوو! تەنیا تۆ بە نەبوونی تووشی عەزاب دەبی، چونکە بیرکردنەوەکانی تۆ ئەو درامایەن (Drame) کە لەوانەیە زۆریش دراما نەبێت، لە خۆڕا گەورەیان دەکاتەوە!

خۆشەویستە چارەڕەشەکەم! ئێستا تێگەیشتی کە بیرکردنەوە، یانی ئێش و ئازار و زانیارییش یانی چارەڕەشی! بە داخەوە کە شتێکت لە بەر چاو نەگرت: ئێش و ئازار تاموچێژی ژیانن و بە بێ بوونی ئەوان ئێمە ئیتر مرۆڤ نین! من ئەو نامەیە بۆ دڵخۆشی دانەوەت نانوسم! بۆ خۆشحاڵ کردنتی دەنوسم و دەمهەوێ شوکرانە بژێر بم بۆ ئەوەی تۆ براوە بووی! نەک لە بەر ئەوەیکە توانیت لە دووگیانی خۆت رزگار بکەی، تەنیا لە بەر ئەوەیکە خۆت تەسلیمی ویستی کەسانی دیکە و ویستی خوا نەکرد! بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە بە سەر من هات! بەڵێ! هێندە خۆزگەی کەسانی ئیماندارم لە دڵدابوو هەتا لە کۆتاییدا ئەو هەستە هەڵیخڕاندم و تەسلیمی کردم! سەرەڕای بێدەرەتانی، شوکری خوام دەکرد! تۆ خواوەندی شک و گومانی! نیشانەیەکی پرسیاری لەنێوان هەزاران نیشانەی پرسیاری دیکەدا! تەنیا کەسانێک دەتوانن پێشکەون کە بەردەوام بۆ خۆیان پرسیار دادەنێن! ئەوان خوو بەو ئاسایش و ئارامییەوە ناگرن کە دوای ئیمانداربوونیان بە نسیبیان دەبێت! وکو کەسانێک کە کەشتیەکەیان شکاوە، بۆ چەند ساتێک خۆیان بە بەلەمەکە هەڵدەواسن و پشوویەک دەدەن! دواتر سەر لە نوێ خۆیان دەخەنەوە نێو ئاوەکەوە! بۆ ئەوەیکە دیسانەوە قسەی دژ بە یەک بکەن و حاشا لە قسەکانی پێشوویان بکەن و سەر لە نوێ تووشی عەزاب بنەوە!

دۆستەکەم دەیگوت منداڵەکە هێشتا لە سکی تۆدا ماوەتەوە و تۆش ئامادە نی دەری بێنی! دەڵێی دەتهەوێ بەو کارەت نەزان کاریەکانت قەرەبوو بکرێتەوە و ژیان لە خۆت حەرام بکەی! پێموایە بۆیە هەواڵی لێ ناردووم بۆ ئەوەی داوات لێبکەم واز لەم کارە شێتانەیە بێنی! من لە جیاتی تەمەننا کردن لە تۆ داوات لێدەکەم کە زۆر زوو لەو بڕیارەت پاشگەز بیەوە! ژیان بە لای تۆوە زۆر لەوە خۆشترە کە سەرنج نەدەیتە پەیامەکانی! تا گوێت لە پەیامەکەی دەبێت، وکو سەگەکەی جەک لەندەن کە بە قروسکە قروسک بە شوێن گورگەکان دەکەوت و وردە وردە خۆیشی بوو بە گورگ، پەیامەکەی جێبەجێ دەکەی!

کەواتە ئێمە سبەینێ دەچینەوە بۆ ماڵەوە! هەرچەند دەزانم کە وشەی سبەینێ بۆ تۆ چەشنێک بێحورمەتی و بۆ منیش هەڕەشەیەکە! ناتوانم لە دەوروبەری خۆم ورد ببمەوە و هەست بەوە نەکەم کە سبەینێ ڕۆژێکە کە پڕە لە ئەگەری جۆراوجۆر!

***

زۆر بە خۆشحاڵییەو پێشوازییان لێکردم! دەتگوت تازە لە نەخۆشی ڕزگارم بوە و خەریکی تێپەڕاندنی قۆناغی چاکبوونەوەم! بە هۆی کارێک کە سەرەڕای کۆڵێک گیروگرفت توانیم بە ئەنجامی بگەیەنم، پیرۆزباییان لێکردم! بۆ نانخواردنی ئێوارە دەعوەتیان کردم و باسی تۆشیان هەر نەکرد! تەنانەت ئەو کاتانەش کە قسەکانم دێنایەوە سەر تۆ، نێوچاوانیان تێک دەنا و بەم چەشنە پێیان دەگوتم کە ئیتر بیریشی لێ مەکەوە! شتێکە کە بوە! دواتر دۆستەکەم منی بردە سووچێکەوە و هەر دەتگوت دەیهەوێ قەرارێکی

گـرینگم وەبیـر بێنێتـەوە، گـوتی کـە لـە گـەڵ دوکتۆرەکـە قسـەی کـردوە و ئـەویش پێـی گوتـوە کـە منداڵەکـە بـۆ خـۆی نایەتـە دەرێ و ئەگـەر زوو لـە سکمی دەرنەهێنم، ناو سکم چڵک دەکات و دەمرم! دەبوایـە زۆر زوو بڕیـارم بدایە! زۆر سەیر بوو ئەگەر بۆ راگرتنی هاوسـەنگی ئیـزنم بدایـە تـۆ بڕیـاری ئیعدامەکـەم بـە کـردەوە دەربێنـی! کارم زۆر مـاون کـە دەبـێ بـە ئـەنجامیان بگەیەنم! تۆ هیچکات ئەو کارانەت لە یاد نەچوون بەڵام من لە بیرم کردن! بۆ وێنە دەبێ کارەکانم بـەربڵاوتر بکـەم و بیسـەلمێنم کە هـیچم لـە پیاوێـک کەمتر نییە! دەبێ لەگەڵ نیشانەکانی سەرسووڕمان بجـەنگم و خـەڵک ناچـار بکـەم کـە پرسـیاری جۆراوجـۆر لـە خۆیـان دابێـنن! دەبـێ هەسـتی بـەزەیی پێداهاتنـەوە بـە خـۆم لـەناو ببـەم و قـەبوڵی بکـەم کـە تـاموچێژی ژیـان، خۆشـبەختییە، نـەک ئـێش و ئـازار! خۆشـبەختی یـانی گـەڕان بـە دوای خۆشبەختیدا! ئاخرەکەی دەبێ لە نهێنی ئەو شتەی کە پێی دەڵێن عەشق، تێبگـەم! نـەک ئـەو عەشـقەی کـە لـە سـەر جێگـای خـەو بـە هـەڵمژینی ئەندامـەکانی یـەکتری پێـی دەگـەین، بـەڵکو ئـەو عەشقەی کە بە بوونی تـۆ دەمهەویست بیناسم! بچکۆلەکە! بەداخەوە لێرە نی!

وەها هەست بە نەبوونی تۆ دەکەم کە دەڵێی دەست و چاوم نییە یان کەڕم! بەڵام سـەرەڕای هـەمووی ئەوانـە لـە چاو دوێنـێ و لـە چاو ئـەمڕۆ بـەیانیش کەمتر دڵم بۆت تـەنگ بـوە! زۆر پێکەنینییـە! دەڵێن ئێش و ئازار سات بـە سـات کـەمتر دەبـێ هـەتا دەگاتـە ئەوەیکـە ئیتـر نامێنێـت! گورگـەکان بـە لورەلورەکـەیان بانگهێشـتم دەکـەن بـەڵام گرینـگ نییـە، چونکـە هێشـتا دەنگـەکانیان زۆر دوورە! کاتێـک نزیـک ببنـەوە، دەکەومـە شـوێنیان! ئایـا بـە راستی ئێش و ئازاری من ئەوەندە زۆر و درێژخایەن بوو؟ بە گومانـەوە ئـەو

پرسیارە لە خۆم دەکەم! جارێکیان لە کتێبێکدا خوێندمەوە کە ناخۆشترین عەزاب بۆ کەسێکی تۆمەتبار ئەو کاتەیە کە ئازاد دەکرێ و پرسیار لە خۆی دەکات: چۆن توانیم لەو جەهەنەمەدا خۆم راگرم؟ لە قسەیەکی باش دەچێت! بە راستی ژیان زۆر سەیرە! برینەکان بە خێراییەکەی سەرسوورهێنەر چاک دەبنەوە و ئەگەر جێگاکانیشیان نەمێنێتەوە ئێمە ئیتر هیچکات وەبیرمان نایەتەوە کە رۆژێک لە رۆژان لەو شوێنەی جەستەمانەوە خوێن دەتکا! جاری وایە هەر شوێنی برینەکان نامێنێ! سەرەتا کەمرەنگ دەبنەوە و دواتر هیچ ئاسەوارێکیان نامێنێ! چارەی ئەم برینەش هەر ئەوەیە! بە راستی هەر ئەوەیە! دەبێ ئەوە بێت! زۆر حەز دەکەم کە ئاسەوارەکەی لەناو بچێت! ئێستا وێنەکەت لە دیوارەکە دەکەمەوە و ناهێڵم کە چاوەکانت هەستم هەڵخرێنن! وێنەکانی تریش دەشارمەوە! باشتر وایە بیاندڕێنم! ئەم بێشکەیە کە وەکو تابووت بە دوای خۆمدا رامکێشا، کوت و لەتی دەکەم و دەیخەمە ناو سۆبەکەوە! جلەکانت دەشارمەوە هەتا رۆژێک کە کەسێک بدۆزمەوە و وەک دیاری پێشکەشی بکەم! باشتر وایە ئەوانیش فڕێبدەم! تەلەفۆنێک دەکەم بۆ دوکتۆرەکە دەڵێم نۆرەیەکم بۆ دابنێت و پێی دەڵێم کە ئیتر هیچ گرفتێکم نییە و دەبێ لەم رۆژانەدا دەرت بێنێت! دواتر تەلەفۆنێک بۆ باوکت دەکەم و هەر ئەمشەو لەگەڵی دەخەوم! ئیتر لە پاکی وەڕەس بووم! تۆ مردی بەڵام من زیندووم! هێندە زیندووم کە هەر پەژیوان نیم و هیچ سزایەکیش قەبووڵ ناکەم! تەنانەت لێبوردنی تۆش! ... بچکۆلەکە! گورگەکان لەم نزیکانەن و من هێندەم هێز لەبەر ماوە و لە خۆم رادەبینم کە سەد جاری دیکەش بێ ئەوەیکە داوای یارمەتی لە هیچ کەسیش بکەم، تۆم ببێتەوە ...

چ ئێش و ئازارێک! ئای کە چ ئێش و ئازارێکە! لە ناکاو تێکچووم! دیسان چی بوە؟ دیسانەوە برینی هەر ئەو چەقۆیانەیە! هەر وەکو پێشوو هەتا مێشکم دەچن و دەیانهەوێ کونی بکەن! ئارەقەم کردوە! تام بەرز بۆتەوە! کات و ساتی لێک جیابوونەوەمان نزیک بۆتەوە! بچکۆلەکە! حەز ناکەم بە کەوچک دەرت بێنن و لە نێو زبڵدانەکەدا بتخەنە پاڵ لۆکە و گازی پیسەوە! حەز ناکەم! بەڵام هیچ چارەیەکم نییە! ئەگەر زووتر نەچمە نەخۆشخانە و تۆ دەرنەهێنن کە بە دڵ و ریخۆڵەمەوە نووساوی، دەمکوژی! من نابێ و ناتوانم ئیزنی ئەوەت بدەمێ! بچکۆلەکە! تۆ هەڵەت کرد کە گوتت من باوەڕم بە ژیان نییە! بە پێچەوانە! من زۆرم ئیمان بە ژیان هەیە! ژیان بە هەموو ناخۆشیەکانیەوە لای من خۆشەویستە و هەر چۆنێک بێت لە گەڵی رادێم! من دەڕۆم! بچکۆلەکە! دەڕۆم و بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە ماڵئاواییت لێدەکەم!

***

میچێکم لە سەر سەرە و لە تەنیشتیشم لە ناو شووشەیەکی ... تۆی تێدای! نەیاندەهێشت بتبینم! بەڵام بە زۆری رازیم کردن کە ئەوە مافی خۆمە و ئەوانیش بە سەروسیمایەکی تێکچڕژاوەوە شوشەکەیان لە تەنیشت قەرەوێڵکەی من دانا! لێت دەڕوانم و پێکەنینم دێتێ! تۆ هەر لەو منداڵە ناچی کە لە وێنەکەدا دیتم! خۆ تۆ منداڵ نی، تەنیا تۆوێکی! تۆوێکی بۆر کە لە ئەڵکۆڵی پەمەیی رەنگدا سەراو کەوتوە و هیچیشی تێدا نابیندرێت! تۆ زۆر زووتر لەوە مردبووی کە دوکتۆرەکان پێیانزانی! هیچکات نەبوویتە خاوەنی نینۆک و پێست و ئەو شتە پڕبایەخانەی دیکە کە من پێموابوو! تۆ تەنیا هەڵقولای خەیالاتی من بووی و تەنیا چەند نیشانەیەک لە دوو دەست و پێ

و شتێکی وەکو جەستە و شێوازێک لە لووت و چاوە میکرۆسکۆپیەکانت دەرکەوتبوون! من عاشقی ماسییەکی چکۆڵە بووم! ماسییەکی چکۆڵە کە عەشقە پڕ ئازارەکەی هێندەی نەمابوو بمکوژێت! بۆ باوەڕ پێکردن نابێت! چونکە زووتر لە ناوم بردی! بۆچی ئەو هەموو کات و ساتە پڕبایەخانەم بە هەدەر دان و هێشتم ژاراویم بکەی؟ باش نیم و هەموان نیگەرانن! دەرزییان لە دەستی راستم و جمگەی دەستی چەپم داوە و بۆریە درێژەکان وەکو مار بە دوو دانە سێڕۆم ( مغذی) پەیوەند دراون! پەرەستارەکان لە سەر پەنجەی پێیەکانم دێن و دەچن و دوکتۆرەکانیش جارجارە دێنە سەر سەرم و پێکەوە هێندێک قسە دەکەن کە من لە ماناکەیان تێناگەم، بەڵام هەست بە مەترسی دەکەم! ئامادە بووم دارونەدارەکەم بدەم بۆ ئەوەی دۆستەکەم یان باوکت، یان لە هەموان گرینگتر چاوم بە دایک و باوکی خۆم بکەوێت! هەستم دەکرد گوێم لە دەنگیانە، بەڵام بێجگە لەو دوو پیاوە سپی پۆشە چاوم بە کەس نەکەوت! یەکێک لەوان هەر ئەوە بوو کە منی تاوانبار کرد! چەند دەقیقە لەمەوبەر سەری لێ شێواو و گوتی:

ـ دوو هێندەی بکەن!

چی دوو هێندە بکەن؟ سزای من؟ خۆ من سزاکەم کێشاوە، دەبێ سەر لە نوێ دەست پێبکاتەوە؟ دواتر گوتی:

ـ خێراکەن! بۆ تێناگەن، خەریکە لە ناو دەچێت!

کێ لە ناو دەچێت؟ دەرزییەکە؟ مرۆڤ؟ ژیان؟ ئەگەر پێمان خۆش نەبێت ژیان لە ناو ناچێت و کەسیش نامرێت! تەنانەت تۆش، چونکە پێشووتر

مردووی! مردووی بێ ئەوەیکە لە مانای ژیان تێبگەی و ڕەنگ و تام و بۆن و دەنگ و هەست و بیرکردنەوەکانیش بناسی! بۆ خۆشم و بۆ تۆش بەداخەوەم! هەست بە شەرمەزاریی دەکەم! پێمەوایە سووکایەتیم پێکراوە! کاتێک توانای ئەوەت نەبێ پەڕەسێلکەیەکی دیکەت ببێ و ئەوانیش هی دیکەیان ببێ کە بتوانن بە ئاسماندا هەڵفڕن، پەڕەسێلکەبوون و هەڵفڕین لە ناو هەورەکاندا چ بایەخێکی هەیە؟ کاتێک توانای بوونی منداڵێکی ترت نەبێ بۆ ئەوەی ئەوانیش منداڵیان ببێت و بتوانن یاری بکەن و بە خۆشی رابوێرن، منداڵی بە کەڵکی چی دێت؟ تۆ دەبوایە خۆڕاگریت بکردایە! دەبوایە خەباتت کردبایە و براوە بوایەی! زۆر زوو ئاشبەتاڵت کرد و گۆڕەپانەکەت بە جێ هێشت! تۆ بۆ ژیان دروست نەکرابووی؟ کێ لە دووسێ قسە و هەواڵی نەگبەت دەترسێت؟ تۆ وەکو باوکت بووی! ئەو بە پەنا بردنە بەر خوا کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا و تۆش بە لەدایک نەبوونت! کاممان تەسلیم بووین؟ خۆ من تەسلیم نەبووم! زۆر هیلاکم! قاچەکانم هێزیان تێدا نەماوە و هێندێک جار چاوم لە ڕەشەوە دێن و لە گوێچکەمدا دەنگێک دەزرینگێتەوە کە وەکو وزەوزی مێشوولە دەچێت! بەڵام خۆ چاوت لێیە کە سەرەڕای هەمووی ئەوانەش تەسلیم نەبووم! چاوت لێیە کە بەربەرەکانێ دەکەم! من و تۆ زۆر لێک جیاوازین! نابێ بخەوم! دەبێ بە خەبەر بم و بیر بکەمەوە! ڕەنگە بتوانم بە بیرکردنەوەکانم بەرامبەرکێ بکەم! چەندە لە سکی مندا بووی؟ چەند رۆژ؟ چەند حەوتوو؟ چەند ساڵ؟ رۆژەکانم لێ دەبوونە ساڵێک! نەمدەتوانی لەوە زیاتر لەو شوشەدا راتبگرم! دەبێ لە شوێنێکی بە حەیا داتبنێم! بەڵام لە کوێ؟ ڕەنگە لە بن قەدی درەختی ماگنۆلیاکە! بەڵام ماگنۆلیاکە زۆر دوورە! ئەو لە شوێنی سەردەمی

منداڵی منه! ئەم سەردەمە ماگنۆلیای نییە! ماڵەکەی منیش ماگنۆلیای نییە! دەبێ بتبەمەوە بۆ ماڵەکەم! رەنگە سبەینێ ئەو کارە بکەم! شەو داهاتوە و میچەکە وردە وردە رەش هەڵدەگەڕێت! هەوا ساردە! باشتر وایە باڵتۆکەم لە بەر بکەم و بە قادرمەکاندا بچمە خوارێ! خێراکە با بڕۆین! تۆش لە گەڵ خۆم دەبەم! بچکۆلەکە! بەڵام هێندە چکۆلەی کە ناتوانم لە سەر دەستەکانم هەڵتگرم بەو مەرجەش کە با نەتبات! لە شتێک تێناگەم: بایەکە دەتوانێ بتبات بەڵام لە سەر دەستەکانی من ئەوەندە قورسایی دەکەی کە من لاقم تێک باڵدەدرێن! تکات لێدەکەم دەستت بخە نێو دەستم! ئێستا ئەوە تۆی کە من لە گەڵ خۆت دەبەی! کەواتە تۆ نە تۆوێکی، نە ماسییەکی چکۆلەی! تۆ منداڵێکی! بالات هەتا ئەژنۆی من دێت! نا! هەتا سەر شانەکانم! نا! لە شانەکانیشم بەرزتر! تۆ منداڵ نی! پیاوێکی! پیاوێک کە دەستەکانی بەهێزن! لەمەودوا پێویستیم بە دەستەکانت هەیە! پیر بووم! ئەگەر دەستم نەگری ناتوانم لە قادرمەکان بچمە خوارێ! لە بیرتە ئەو کاتانەی کە پێکەوە نوسابووین بە چ شێوەیەک بە قادرمەکاندا ئاموشۆمان دەکرد و ئاگامان لە خۆمان بوو بۆ ئەوەی نەکەوین؟ لە بیرتە ئەو کاتانەی کە تازە پێت هەڵگرتبوو و فێرم دەکردی کە چۆن لە قادرمەکان سەرکەوی و پێکەوە قادرمەکانمان دەژمارد و پێدەکەنین؟ لە بیرتە هەر شتێک کە تووشی بوایەی بە هەر دووک دەستەکانت دەتگرت و چاوەڕێت دەکرد هەتا من بە دەستێکی نیگەرانەوە خۆم بگەیەنمە ئەوێ؟ ئەو رۆژانەت لە بیرە کە گوێت لە قسەکانم رانەدەگرت و منیش لەگەڵت بەشەڕ دەهاتم؟ دواتر پەژیوان دەبوومەوە! حەزم دەکرد داوای لێبووردنت لێبکەم بەڵام نەمدەتوانی! من لە

ژێــرەوەڕا لــێم دەڕوانــی و تــۆش هــەروا، دواتــر کاتێــک بــزەت دەهــاتێ تێدەگەیشتم کە لێبوردنەکەمت قەبوڵ کردوە و دواتر ... دواتر چی دەبوو؟

پێڵوەکانم قورس بوون و مێشکم خەریکە لەکار دەکەوێت! ئەوە خەونە یان کۆتایی! نابێ تەسلیمی ئەو خەونە یان ئەو کۆتاییە بم! یارمەتیم بدە با خەوم لێ نەکەوێت! وەڵامم بدەوە! تێگەیشتی نەمانی ئەو گرفتە چەندە بەکەڵکە؟ لەو خوارە زۆر کەس لە هەوڵی ئەوە دابوون کە تۆ بکەنە ئامانجی خۆیان و ئازاریــان دای و تــۆش تەقــەت لێکــردن؟ تەســلیمی فێــڵ و تەڵەکــە و زۆروێژیەکانیان بووی یان وەکو درەختێکی قیت و قایم لە سەر جێگاکەت راوەستای؟ ئاخرەکەی تێگەیشتی کە داخوا بەختەوەریی و ئازادیی و باشیی و عەشق، بوونی هەیە یان نا؟ هیوادارم کەڵکت لە نەسیحەتەکانم وەرگرتبێ! هیوادارم هیچکات ئەو کفرە نەکەی کە:

ـ من بۆچی لە دایک بووم؟

هیوادارم بەو ئاکامە گەیشتبی کە بۆ ئەوەی زیندوو بی دەبێ ئازاریش بچێژی! تەنانەت ئەگەر بە نرخی عەزاب و مەرگیش تەواو بێت! لەوەیکە توانیم ــ بە نرخی مردن و ئازارکێشانیش بووبێت ــ تۆ لە نەبوونی جیا بکەمەوە، هەست بە شانازی دەکەم! هەوا بە تەواوی سارد بوە و ئەو میچە سپییە ئێستا ئیتر رەش رەش داگیراوە ... بەڵام گەیشتینێ! ئەوەش گوڵی ماگنۆلیا! گوڵێک لێ بکەوە! من هیچکات نەمتوانی بەڵام تۆ دەتوانی! بچۆ سەر پەنجەی پێت و پەنجەی دەستت درێژ بکە! ... تۆ لە کوێی؟ هەر ئێستا لێرە بووی! ژێر باڵت گرتبووم! گەورە بووی! بۆ خۆت پیاوێک بووی بەڵام دیار نەمای! بێجگە لە شوشە ئەڵکۆڵێک کە شتێکی تێدا سەرئاو

کەوتوە، هیچی دیکەی لێ نییە! شتێک کە حەزی نەدەکرد نە ژن بێت و نە پیاو و منیش یارمەتیم نەدا کە ببێتە ژنێک یان پیاوێک بۆ خۆی! لێم دەپرسی داخوا من بۆچی ملم بەو کارە دا؟ ئەی تۆ بۆچی بەوە رازی بوویت؟ چونکە ژیان لە گەڕدایە بچکۆلەکە!

بە دەربڕینی ئەوەیکە ژیان بوونی هەیە، سەرماکە نەما و خەوەکەشم رەویەوە! هەست دەکەم سەر لە نوێ بوومەوە بە خۆم! ژیان ... سەیری بکە! چرایەک هەڵدەبێت! دەنگێک دەبیستم! کەسێک هەڵدێت، هاوار دەکات و بێ هیوا دەبێت! بەڵام بە هەزاران کەس لە دایک دەبن! بە سەدان هەزار منداڵ! ئەو منداڵانەی کە رۆژێک لە رۆژان بۆ خۆشیان دەبنە دایک یان باوکی منداڵانی نەوەی دواتر! ژیان هیچ پێویستییەکی بە من و تۆ نییە! تۆ مردووی! منیش لەوانەیە بمرم! بەڵام گرینگ نییە، چونکە ژیان هەر بەردەوامە!